# نامەی کەسە مەزنەکان

**وەرگێڕانی:**

**نەبەز گۆران**


- ناوی کتێب: نامەی کەسە مەزنەکان
- نووسەر: کۆمەڵێك نووسەر
- وەرگێڕانی: نەبەز گۆران
- بابەت: نامە
- مونتاژ و بەرگ: یانەی قەڵەم
- تیراژ: (٥٠٠) دانە
- چاپ: یەکەم (٢٠١٣)
- چاپخانە: یاد، بازاڕی سۆز–نهۆمی سێیەم
- نرخ: (٢٠٠٠) دینار
- لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٦٦٢)ی ساڵی ٢٠١٣ پێ دراوە.

# نامەی کەسە مەزنەکان

**وەرگێڕانی:**

**نەبەز گۆران**

**سلێمانی ٢٠١٣**

**لە چاپکراوەکانی پڕۆژەی کتێبی یانەی قەڵەم**

**زنجیرەی ژمارە (١٢٠)**

سەرپەرشتیاری پڕۆژە: جەبار سابیر

جێگری سەرپەرشتیار: ئارام سدیق

ناونیشان: یانەی قەڵەم، سلێمانی، سابونکەران، بینای هەورامان نهۆمی سێهەم.

## پێشەکی:

هیچ نووسین و بابەتێك هێندەی نامەکان دیوە شاراوەکەی مرۆڤ دەرناخەن. کۆی ئەم نامانە کە لە چوار چێوەی ئەم کتێبەدا دەیبینین. بریتین لە نامەی ئەو کەسانەی هەریەکە و لە شوێنی خۆیەوە دەستکاریەکی دونیای کردوە. هەڵبەتە ئەدەبیاتی نامە لە ناو میلەتەکاندا یەکێکە لە پاییە سەرەکیەکانی ئاشکراکردنی خودی ئەو کارەکتەرەی نامەکەی نووسیوە. نامەکان هەمیشە پێمان دەڵێین ئەوە مرۆڤە راستەقینەکەیە. ئەو مرۆڤەیە لە ناخەوە خۆی حەشارداوە و لە ناو نامەکاندا دەدوێت. ئەشێت ئەدەبیاتی کورد پر بێت لە نامە و هێشتا کەسێك نەهاتبێت بەشێکی ئەو نامانەی کۆکردبێتەوە لە چوار چێوەیەکدا بیانخاتە بەردەم خوێنەران. بەهەمان شێوەش چ لە ناو سیاسیەکان، یاخود لە ناو رۆشنبیر و جەنگاوەرەکاندا نامەگۆڕینەوە بەبەشێك لە ژیان دەبینرێت. ئەم هەوڵەی من تێکەڵەیەکە لە نامەی سەرکردە و شۆرشگێر و فەیلەسوف و شاعیران و نووسەرانی دونیا.

یانی ویستم ئەو دیوەی کە لای ئێمە تاریکە لەرێگای نامەکانیانەوە بیناسین. ئەگەرچی ئەمە هەوڵێکی زۆر سەرەتاییە. بەڵام کردنەوەی دەرگایەکە تاکو بتوانین دەست بۆ ئەو میراسە گەورەیە ببەین ناوی ئەدەبیاتی نامەیە. لە بەر ئەوەی بتوانین هیچ نەبێت دیوەکەی دیکەی ئەو کەسانە ببینن کە تەنها لە ناو نامەکاندا دەبینرێت. لە هەر هەڵەو کەموکورتیەك ببورن. ئەمە نە کارێکی هێندە مەزنە تا من خۆم بە غرورەوە لەسەری بدوێم. نە هیچ کارێکیش بەبێ کەموکوری دەبێت. وەك



وتم هەنگاوێکە بەرەو ئەو دونیایەی کەمترین کاری تێداکراوە. بە ئومێدی ئەوەی لە ئاییندەدا کاری دیکەی لەم جۆرە بخەینە بەردەم خوێنەران. تاکو پێکەوە وەك خوێنەر سود لەو جیهانە ببینین لە نامەکاندا رونترو سادەتر خۆی دەبینێت. بەهیوای خوێندنەوەی.

وەرگێر

**نامەیەکی " ئەبراهام لینکۆڵن"**
سەرۆکی پێشو ئەمریکا بۆ مامۆستای کورەکەی.

سڵاو مامۆستای بەرێز..
تکایە کوڕەکەم فێر بکە..
بابزانێت هەموو خەڵك دادپەروەر و راستگۆنین، پێی بڵێ ئەگەر بگەرێت لەناو مرۆڤەکاندا چەندین کەسی راستگۆ هەیە. پێی بڵێ لەناو سیاسیە خۆپەرستەکانیشدا، سەرکردەی بەئەمەك بونی هەیە. پێی بڵێ لەناو هەموو دوژمنێکدا دۆستێك هەیە، ئەزانم کاتت دەگرم: بەڵام فێریکە، بەئەرکی سەرشانی خۆی یەك دۆلار پەیدا بکات، باشترە لەوەی لەسەر زەوی پێنج دۆلار بدۆزێتەوە. فێریکە سود لەشکستەکانی ببینێت و چێژ لەسەرکەوتنەکانیش وەربگرێت. تۆزێك ترسی لە ئاواتەکانی هەیە، تۆدەتوانی هەر بەزەردەخەنە زۆر شتی بیربخەیتەوە. ئەگەر دەتوانی وێنە گرنگەکانی ژیانی فێرکەیت و رای بهێنێت لەسەر ئەوەی باش بیریان لێ بکاتەوە.
پێی بڵێی بیربکەوە لە: فرینی باڵندەکان بەئاسماندا، لەگوڵەکانی ناوباخچەکە، لە زەردەواڵەکان کاتێك بەناو بادا تێدەپەڕن، با وردبینبێت، کورەکەم فێرکە لە قوتابخانە بمێنێتەوە باشترە. تا بە قۆپیەکردن دەربچێت، بەهێنی بەبیری بهێنەوە.دەبێت ئارام و سەربەرزبێت، فێریکە باوەر و ئیمانی خۆی لەدەست نەدات. نەنانەت ئەگەر هەموان دژی بن. فیریکە گوێ لە وشەو قسەبگرێت و کامیانی پێ باشبوو هەڵیبژێرێت، کورەکەم فێرکە بایەخ بەژیان بدات، ئەگەر دەتوانی فێریکە لەکاتی نیگەرانیدا زەردەخەنە بکات.



پێی بڵێ فرمێسك رشتن عەیبە نیە. پێی بلێ فێربێت بە بیرکردنەوە کەسەکان هەڵبژێرێت نەك بەدڵ، پێی بڵێ هەرگیز بەهاتوهاوار تێك نەچێت. ئەگەر لەسەر حەق بێت با بەو هاتو هاوارانە پێبکەنێت. حەزەکەم لە وانەکاندا بەهێمنی لەگەڵی بجوڵێتەوە، بەڵام بەهیچ شێوەیەك بەنازەوە پەروەردەی نەکەیت. لێبگەرێ با ئازابێت. پێی بڵێ لەگەڵ خەڵکی باش بێت و چی پێدەکرێت بیکات. دەبێت ئەوەش بڵێم راستە کورەکەم منداڵە بەڵام جوان گوێدەگرێت.

**نامەیەکی : پاشا هنری چوارەم**

بۆ ئازیزەکەی

یەك رۆژی تەواوە. بە نا ئارامیەوە چاوەری جوابی تۆم، بۆگەیشتنی نامەیەك چرەکەکانم دەژمارد. جگە لەوە هیچ شتێك بەلامەوە گرنگ نەبوە. بەڵام کێشەم نیە ئەگەر یەك رۆژی تریش چاوەرێ بکەن. مەگەر خزمەتکارەکانم تەمبەڵی بکەن یان لەرێگە بەدەستی دوژمنەکان دەستگیربکرێن. چون خۆم ناوێرم سەرت لێبدم. ئەی فریشتە جوانەکەی من. لەپەیوەندی و ئەوینی تۆ دەرهەق بەمن زۆر دڵنیام. هەڵبەتە دڵنیابە ئەو ئەوین و خۆشەویستیەی هەمە بۆتۆ هەرگیز روینەداوە. بەڵگەشم بۆئەمە ئەوەیە لەهەموو نامەکانمدا بەم رستەیە هەستی خۆم دەردەخەم بۆت." وەرە، وەرە، وەرە ئەی مەعشوقی ئازیزی من".

حەزەکەم بەو شیرینیەی خۆتەوە ئەو شانازیەم پێببەخشی. ئەگەر کاتەکەی گونجاو بوایە. هەزاران فرسەخم دەبڕی تا بگەمە بەرپێت و لەبەردەم پێیەکانتدا چۆك دادەم و ئیتر هەرگیز لێت دورنەکەومەوە. ئەگەر حەزدەکەیت هەواڵی ئێرە بزانیت. دەبێت پێت بڵێم ئاوی دەرونم بەرەو وشکی دەچێت و ناڵەی دڵم هەمووشتێکی تێکداوەو بەویستی خودا تارۆژی هەینی هیچ باش نابم(١). ئەگەر سبەی رۆژی حەزتکرد بزانی چیدەکەم. هەمووجارێ لەگەڵ خوشکەکەم ئەچمەوە ئەو شوێنەی کە تۆم تێدابینی تا کەمێك ئاسودەبم. یەك چەپکە گوڵی پرتەقاڵیم بۆ حازرکردویت تاپێشکەشت بکەم، لەرێگەی خوشکەکەی گابرێڵ و،خوشکەکەی هاورێی بەرێزم هنریەوە دەگەنە دەستت. ئەگەر لێرە بویتایە



تێر ماچم دەکردی. لەبارەی ئەوینی خۆمەوە بۆتۆ، دەبێت بڵێم " یەك ملیۆن جار خاکی بەرپێت ماچ دەکەم".

-هنری چوارەم یەکێکە لە پاشاکانی فەرنسا، لەساڵی " **١٥٥٣**تا **١٦١٠**"

-(١)_ لێرەدا ئەوینی خۆی بۆخۆشەویستەکەی بەشێوەی شەرو خەندەق و تۆپ دەچێوێنت. ئەمما ئێمە دەسکاریمان کردوە.

-ئەم نامەیە لە رێکەوتی **١٦** ژولی **١٥٩٣** نوسراوە. یانی " **٤٢٠**" ساڵ بەر لەئێستا.

**نامەیەکی جۆن کیتسی شاعیر**

بۆ خۆشەویستەکەی

فانی شیرینم.........

لەوانەیە نیگەران بوو‌بیت لەوەی ئەو هەمووە چاوەڕێ بکەیت تا خۆشەویستی خۆمت بۆدەرخەم . ئەزیزم باپێت بڵێم خۆشم دەوێیت بۆ هەمیشە بێهیچ مەبەست و مەرجێك. هەرئەوکاتەی تۆم ناسی. هەستم بە پەیوەندیەکی تایبەت دەکرد لەگەڵتدا. هەموو هەستی من و تەنانەت غیرەکردنەکانیشم بۆ ئەوینی تۆبوو. لەخۆشترین کاتەکانمدا ئامادەم بۆتۆم بمرم. لەوانەیە تۆم نیگەران و خەمبارکردبێت. بەڵام تۆ سوێند دەدەم بە ئەوین. ئایا هیچ شتێك هەیە من بتوانم بیکەم؟. دەزانی تۆ هەمیشە بۆمن تازەیت.دواهەمین پەیوەندی تۆ شادی هێنەربووە و دواهەمین جوڵانەوەی تۆ جوانترین شت بوە کە دیبێتم. بەبێتۆ ناتوانم بژیم. جگە لەدیداری تۆ هەمووشتێکی دیکەم فەرامۆشکردوە. لێرە بەبێتۆ خەریکە ژیانم بەکۆتا دەگات. ئیدی هیچی دیکە نابینم تکایە زوو وەرە بۆلام. هەستەکەم لەحاڵێکی باشدا نیم. هەمیشە سەرم سورماوە لەوانەی لەسەر ئاینەکەیان شەهید دەبن. کاتێك بیرم لەوە دەکردەوە دەلەرزیم. بەڵام ئێتر نالەرزێم. چونکە من ئێستا دەتوانم لەبەرخاتری ئاینەکەم شەهید ببم. عەشق ئاینی منە. دەتوانم لەبەر عەشق بمرم. دەتوانم لەپێناو تۆدا بمرم. داخوازی من تەنها ئەوەیە لەگەڵ تۆدا بژیم چون زۆر باوەرم پێتە. بە ئومێدی ئەوەی تۆش هەرگیز نائومێدم نەکەیت .



- جۆن کیتس: خەڵکی شاری لەندەنە. ساڵانی ( ١٧٩٥) لەدایك بوە.و لە ( ١٨٢١) کۆچی دوای کردوە. یەکێکە لەو شاعیرە ڕۆمانسیانەی سەردەمی خۆیەتی. فانی دراوسێیان بوە کاتێك پەیوەندیان دروستکردوە. بەڵام بەهۆی نەخۆشی جۆنەوە نەیانتوانی پێکەوە بژین چون جۆن پێش بەیەك گەیشتنیان مرد. تابلۆکە شێوەی شاعیرە..

**نامەیەکی لۆرکا ..**

بۆ / ماریا دل ریپۆزا...

هاوڕێی موحتەرەم و دڵ ئارامم..

لەوانەیە زۆر لات سەیربێت لەم سەرتای یەکتر ناسینەوە ئاوا بەدڵ گەریمەوە نامەت بۆ دەنوسم. بەڵام وێنەی تۆ بەجۆرێك لە خەیاڵمدایە بەهیچ شتێك لێم دور ناکەوێتەوە. هەستەکەم ئیتر کاتی ئەوەیە روبە روو قسە لەگەڵ خۆت بکەم. لەوانەیە ئەم جۆرە نامانە پەیوەندی دوو رۆح دەر بخات . وایە؟.. پێمەکەنە.. ریپۆزا تکایە پێمەکەنە.. بمبورە کە جەسارەتم بەخۆم داوە ئەم نامەیە بۆ تۆ بنوسم.( دەڵێم جەسارەت، چون ئەم جۆرە ئیشانە لە ئیسپانیا جەسارەتی دەوێت ). دەمەوێت کتێبێك چاپ بکەم. رێگەم دەدەیت بەشێکی ئەو کتێبە پێشکەشی تۆ بکەم؟.. تکایە وەڵامم بدەرەوە..

دەزانم شانازی بەوەوە دەکەیت وەڵامی من بدەیتەوە. من لەخانمێکی وەکو تۆ کە بەم شێوە باشە رەخنە لە کارەکانم دەگریت چاوەڕێی شتی دیکە ناکەم. هاوڕێ بچکۆلەکەم. من برێ جار لە ژیانم ئەو رۆحەم خۆشدەوێت کە دورە لێمەوەو دەستم نایگاتێ تا نامەیەکی بۆ بنوسم و پێی بڵێم. لەم دورەوە گوێم لە دەنگی رۆحتە. من لەم سەردەمەدا زۆر رۆمانسیم. تا لەژێر سێبەری ئەم کۆمەڵگەیەدا ناخی خۆم پاك بکەمەوە. لەوانەیە تۆش وەك من زۆر رۆمانسی بیت و بیر لەو شتانە نەکەیتەوە بە پارە دەست دەکەون. ئەگەر ئەم قسانەی من تۆش بهێنە پێکەنین ئەمە راستی منەو دەیلێم. ببورە ئەگەر تۆم شڵەژاندبێت. هەستدەکەم ناخم



قوڵپ دەدا. دڵنیابە بێزارت ناکەم. لەخواستی من تێدەگەیت؟. خۆ لە دڵگەری من تێدەگەیت؟. تۆ لەو جۆرە ژنانەی لە پێش ژیانەوە دەڕۆن، بەهەر لایەکدا بڕۆن عەتری ئارامی و میهرەبانی دەپژێنە رۆح و لەشونێکیشن دەستی کەس نایانگاتێ. وەك بۆنی گوڵێکی دور. بمبورە وابزانم زیادەرەویم کرد وانیە؟ بەبێ ئەملاو ئەولا جوابم بدەرەوە. مەجبورت ناکەم بە زۆر شتێك بڵێیت . بەڵام لە دڵەوە سوپاست دەکەم. دەتوانی بۆهەمیشە متمانەت بە من بێت..

" شەوی یەکەمی فەبریوەر ١٩١٨ "

- لۆرکا یەکێکە لە شاعیرە مەزنەکانی جیهان. کە بەرهەمەکانی وەرگێراونەتە سەر زۆربەی زمانەکانی دونیا..

**نامەیەکی ژولێت بۆ :**

ڤیکتۆر هۆگۆ ....

ئایا ئەمشەو لای تۆ خۆشبوو...

لەمن بپرسە.. ئەی بتی من. بەجۆرێك چێژم لێ‌بینەوە. باس ناکرێت. ئەم شەو لای من شەوێکی بێ‌کۆتایی بوو، شەوێکی فەنابوون و ئەبەدی بوو. من نازانم ئەمشەو ناوبنێم چی. من ئەمشەو وای لێکردوم نازانم بەچ شێوەیەك باسی بکەم. تەنها دەتوانم بڵێم ئەمشەو، خودای من خودای ئەستێرەکان و ئەفرێنەری ئاسمان و دونیا، گەورەترین ئارەزوی منی هێنایە باوەشم. تەمەنێك بوو بەدەم چاوەروانیەوە لەتینیویەتی ئەو شەوەدا دەسوتام. تەمەنێك بوو لە کۆشکی خەونەکانمدا تارمایی ئارەزوەکانم رەنگ دەکرد تا ئەمرۆببینم. . ئەمرۆ لای دکتۆربوم... بیستم کەسێك لە ناو دڵمدا سەری دەرهێناوە. روناکی و شادمانی لەناو گیانمدا دروست دەکات و منیش لەخۆشیا هاوار دەکەم. ... دەگریم.... پێدەکەنم.

ئەو لەژێر چاوەوە سەیری دەکردم سەری سورمابوو. بەڵام نەیدەزانی ئەوین چ میوەیەکی ئازیزە. ئەو نەیدەزانی و، لەهەستی من نەدەگەیشت، لەو هەستە شکۆدارەم نەدەگەیشت کە لە چ کاتێکی پڕ لە خۆشیدا بووم. ئەرێ‌بەراست ئەوە من باسی چی دەکەم؟. خودایە خۆزگە زمانێکت پێدەبەخشیم دەمتوانی باسی ئەو خۆشیانەی خۆم بکەم. گوێ‌بگرە ڤیکتۆر... لەناو دڵی مندا ڤیکتۆرێك هەیە خۆم پەروەردەی دەکەم، بەڵام



دەبێت ئەوە بزانی هی خۆمە هی کەس نیە. ئەوە تەنها ماڵی منە، ماڵی من بەتەنیا، ئەم ڤیکتۆرە ئیتر هیچ کەس ناتوانێت لێم بسەنێت. ئەی تۆ دەڵێی چی؟

لەم دانپیانانە شیرینە. لە بیستنی ئەم هەموو راستیە پیرۆزە دڵت خۆشە؟.. ئەوە منم خۆشبەختم. ئەوە منم ئارەزوێکم هەیە ئەویش ئارەزوی گەیشتنە بەتۆ. من تۆم خۆشدەوێت. بە دڵ و بەگیان ئەو قسەیەت پێدەڵێم. هەموو ئەو شتەی لەناو بونی مندا هەیەو دەرکی پێدەکەم هەمووی عەشقە. هەمووی عەشقە...

ژولێتی تۆ..

**نامەیەك لە دیلێكی جەنگەوە..**

بۆ / هاورێكانی ..

مرۆڤە باشەكان...

بیستم هیچ هەواڵی من نازانن. جگەلەوەی لەهەڵمەتێكدا ون بووم. بۆ بەدبەختی من هیچ لەونامانەی بۆ ئەڵمانیاتان ناردوە بەدەست من نەگەیشتوە. بابە كورتی پێتان بڵێم چیمان بەسەر هات:

بە (١٩ دسیەمبەری ١٩٤٤) بەدیلگیرام. لەم رۆژەدا خراپترین هێرشی وەخشیانیی هیتلەر كرایە سەر بەلژیكا ولۆكزمبێرگ. لەشكرەكەی ئێمە دابارین. ئەڵمانەكان دەوریان گرتین و جیهازە بێتەلەكانیشمان پەیوەندیەكانیان پچرا و ئاگامان لەهیچ لایەك نەما. مەجبور بووین شەر بكەین. چەكەكانمان بەرامبەر تانكەكانی ئەوان هیچیان پێنەدەكرا. ئیدی خۆراك و تەقەمەنیمان پێنەما. ناچار تەسلیم بوین. بیستم بەم بۆنەیەوە سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا مەدالیای بۆداناوین پێشكەشمان بكات. نەفرەت لەو مەدالیایە دوای ئەم هەموو رەنج و زەحمەتە بۆم بێت. من یەكێكم بەوانەی پێویستم بەو شتانەنیەو تەنها سوپاس گوزاری خودام. بەهەر حاڵ ئێمەیان شەو رۆژێك بە پێی برد بێ ئەوەی تیكە نانێكمان بدەنێ. سورای فارگۆنێكیان كردین گەرم و ناخۆش. شوێنی مەر و بزن بوو. شوێنی خەوتنمان نەبوو. ناچار تاقمێكمان بە پێوە دەوەستان تا تاقمێك تۆزێك بخەون و ئیسراحەت بكەن. بۆنەگبەتیش لە رێگا كە رۆژی كریسمس بوو. كاروانەكەمان بە فرۆكەی هاوپەیمانەكان بۆردومان كرا و نزیكەی سەد كەسمان كەلەو پاچە بووین. لەهەموی خۆشتر ئەوە بوو رۆژی



كریسمس یەكی پەرداخێك ئاویان پێداین بیخۆین. بردینیان بۆ بەرلین. لە ژێر دوشی ئاوێكی گەرما یەك یەك دەیان شوشتین برێكمان بەو ئاوە گەرمە مردین و برێكی ترماین بە پێستی سوتاوەوە ماینەوە. ئەوانەمان ئەفسەر بون ئیشان پێنەدەكردن بەس خۆتان دەزانن من سەرباز بووم. ئیدی رۆژ تا ئێوارە كرێكاریان پێدەكردین. ئۆردوگاكەمان زۆر كەورەبو لەنزیك بەرلین. رۆژانە سەدو پەنجا نانی سوتاویان دەهێنا بۆ ئەو جەماعەتەی ئێمە. كەیفی خۆتە بیخۆ. منیش رۆژێك ویستم گاڵتە لەگەڵ پاسەوانێك بكەم. وتم روسەكان دێن عاقڵتان دەكەن. ئەوەنە كوتەكم خوارد تا ئەو رۆژەی بەربوین نەم وێرا گاڵتە بكەمەوە. جەماعەتی هەواڵگری ئەڵمان لەبەر ئەوەی دوو هاورێمان نانێكیان دزیبوو گولەبارانیان كردن.

لە (١٤ فەبریوەر) ئەمریكا بەهاوكاری فرۆكەكانی سەلتەنەتی بەریتا نیا هات. بۆ مبارانی ئەو ناوەی كرد.( ٢٥) هەزار كەسیان كوشت. هەر ژن و منداڵ بوو لەو ناوە بەسوتاوی كەوتبون. ئیتر كە دەیان بردین بۆ كار. خەلكی نەفرەتی لە ئێمە دەكرد و بەردی تێدەگەریتن تادەهاتینەوە هەموو گیانمان دەبوو بەخوێن و شكان. دوای ئەوەی هێزی هاوپەیمانەكان هاتن شوكر ئێمە ئازاد بوین. وە لا ئیدی بۆخۆمان كەوتینە خۆشی و فرۆكەیەكیش هات كتوپڕ لێیداین (١٤) كەسی تری لێ كوشتین. هەشت رۆژ بۆخۆم وەك پاشا لەو ناوە یاریم دەكرد و هەڵدەقونیم. پاشان بە سەیارەكی روسەكان سوار بوین هاتینەوە بۆ ناو سوپای ئەمریكا. سورای فرۆكە بوین و ئێستا من بۆ خۆم دانیشتوم نامە بۆ ئێوە دەنوسم. لێرە ئەوەندە نان زۆرە هەر پێم ناخورێت. كەشتیەكان خەریكی جولانن بەرەو وڵات و منیش دەبێت تۆزێك تەحامول بكەم. هیواخوازم مانگێكی تر

لەماڵی خۆمان بم. (٦٠٠) دلارم وەرگرتوە حەقی دیلیەکەم و دومانگیش ئیجازەم بۆ خۆم هەر کەیف دەکەم. شتی زۆر لەدڵمایە بۆتان باسکەم بابێمەوە ئینجا. نامەم بۆ مەنێرن چون نامە ناگات ئیتر..

" هاورێتان : کورت ونگان "

" ٢٩ مەی ١٩٤٥ "

بۆخۆم هەر عاشقم



**نامەیەکی / ئان سێکستۆن**

بۆ . کایۆی.. مێردی..

ئازیزی دڵم..

دڵم زۆر تەنگە بۆت. ئەوینت ئەم نامەیەو ئەم ماڵەتەنیایەی پڕکردوە. شێوە جوانەکەت لە هەموو شوێنێك دێتە بەرچاوم. کاتێك جێ خەوەکەت و دەستنوسەکانت دەبینم یادی بێ تۆی دێتەوە خەیاڵم. کایۆ..بروام وایە وردە وردە خەریکە خۆم دەدۆزمەوە. دەبێت یەکەمجار خۆم بدۆزمەوە ئینجا کەسێك یان شتێك روناك بکەمەوە. لەهەموو حاڵەتێکدا حەزم لەوەیە گەورەبم. تەنیا تەنیام. لەوانەیە تۆ وابیربکەیتەوە دورم بخەیتەوە لەتەنیایی. بەڵام ئەمە شتێکە لەناخی منا پەیمانی بەستوە لەگەڵم. وردە وردە خەریکە ئەگەمە ئەوەی زۆر پێویستم بەتۆیە. خۆشم دەوێیت. هەستدەکەم هیچ کاتێك عاشقی کەسێك نەبوم. هەمیشە حەزم لەوە بوە لەگەڵ خەڵکی تێکەڵبم بەڵام ئەوان منیان خۆش بوێت نەك من ئەوان. ئارەزومە بچمە ناخی کەسێك لە ژێر سێبەری " ئەودا" شتەخراپەکانی خۆم لەبیر بکەم..

ئێستا خەریکە تێدەگەم... نەرم نەرم تێدەگەم. کەعاشقی تۆم و ئەمەش هیچ مەبەستێکی لەپشت نیە. لە چاوێکی گەشاوە دەچیت لەناو دڵمدا دەدرەوشێتیەوە. هەرچیم هەیە ماڵی تۆیە کایۆ گیان خۆشم دەوێیت...

ئازیزم. هیوادارم ئەم گەورە بوونەی من تۆ نارەحەت نەکات. چونکە هەتا لای خەڵکی گەورەتربم لەتۆ نزیکتر دەکەومەوە. من دەمەوێت ببمە موڵکی تۆ و تۆش ببیتە دواهەمین پەناگای من. من بەبێ تۆ

ناتەواوم. خەمی هیچم نیە جگە لەوەی کە ئێستا تۆ لەتەنیشتمەوە نیت. کۆترەکان دوبارە لەسەر دار کاژەکان هێلانەیان کردەو بەهاریش وادێت. وادێت . وادێت. تۆش دێیت و منیش ئیتر توانای ئەم هەموو چاوەڕوانیەم نەماوە.

کایۆ, هاوسەرەکەت شانازی بەتۆوە دەکات. شوکور بۆخوا لەم دونیایەدا تۆم هەیە..

" ئان سێکستۆن "

" / ١٣ مارسی ١٩٥٧ "



**نامەی تۆماس ئەتۆی**

بۆ: باری

باری ئازیز..

ئەگەر بتوانم تۆ ببینم و دڵم بە خێرایی لێنەدا، یان لە دوریتا دەرد و ئازار نەکێشم. ئیتر پێویستی بەوە نەدەکرد داوای لێبوردنت لێ بکەم. بۆیە جارێکی تر پەیمان دەدەم. تۆم پێش سەلامەتی خۆم و خۆشبەختی خۆم خۆشتر دەوێت. هەرچی بکەیت جوانیەکەت لەپێش چاوم ون نابێت. گەرچی ئەوە بۆ حەوت ساڵە دور لە تۆ ئازار دەکێشم. چیبکەم ناچار بە نا ئومێدیەوە بە حەسرەتی تۆوە بسوتێم.

بەڵام هەر چرکەیەك تۆ ببینم ئەفسونی جوانیەکەت هەمووشتم لەبیر دەباتەوە. سەیرکە چەن خۆشم دەوێت و چۆن ئامادەم لەبەر خاتری تۆ دەست بدەمە هەموو کارێکی مەترسیدار و، چاو لە ئەنجامی ئەو کارە بپۆشم. ئەگەر قبوڵم بکەیت یەك دوو رۆژی تر دێم. ئیتر رزگارم دەبێت لەو هەموو ساڵەی چاوەڕوانی و دەردی سەری. بەس یەك دوو قسەی جوانی ئارام بەخشم بۆ بکە. بەڵێن بێت رازی بم بەوەی تەنانەت سەیری ئەو نیگا جوانانەشت نەکەم. چون بەراستی بەم ساردو سریەی خۆمەوە ناتوانم بەرگەی ئەو نیگا گەرمانی تۆ بگرم...

لەم کاتەدا دڵم ئارەزو دەکات بفرێت بۆلات. ئەگەر نەتوانم بێم بۆلات. لەوانەیە تا سەردەمێکی تر ئیتر نەتوانم گلەی لە تۆ بکەم و باسی دەردەکانی خۆمت بۆبکەم..

" تۆماس ئەتۆی "

- تۆماس ئەتۆی ئەم نامەیەی لە ساڵی (١٦٧٨) نوسیوە. تۆماس یەکێك بوو لە شاعیرەکانی ئینگلیز. باری یەکیك بوو لەو ژنانەی تۆماس عاشقی بوو بوو. بەڵام لەتەمەنی (٣٤) ساڵیدا بەبێ ئەوەی بەیەك بگەن. کۆچی دوای کرد..



نامەی خوداحافیزی
گیڤارا بۆ کاسترۆ...

سڵاو هاورێم..

لەم کاتەدا ئەم نامەیە دەنوسم، یادەوەری زۆر دێنە بیرم. بۆ نمونە ئەو کاتەی تۆم لە ماڵی ( ماریۆ ئەنتۆنیۆ) ناسی. کاتێك پێشنیازتکرد پێکەوە کاربکەین. توشی دەردە سەری زۆر بوم. بیرم دێت رۆژێك لێت پرسیم ئەگەر مردم خەبەر بەکێ بدەم. یەکەم جار بەو قسەیەت زۆر نارەحەت بووم. دوای بیرم کردەوە ئەمە حەقیقە تێکە و دەبێت قبوڵی بکەم. کاتێك مرۆڤ دەستی کرد بە شۆرش دەبێت بە سەربەرزیەوە بمرێت و چەندین هاورێشمان لەم رێگایەدا رۆشتن.

ئەمرۆ ئەو شتەم زۆر بۆ گرنگ نیە. چونکە هەستدەکەم گەورەتر بووم و باشتر لە دووبارە بوونەوەی ئەو حەقیقەتە گەیشتوم. بە هەرحاڵ پێموایە ئەرکی خۆم لە شۆرشی کوبا لەسەر خاکی خۆی ئەنجام داوە و ئێستا بەنیازم لە تۆ و هاورێیانم و، خەڵکی ئەو وڵاتە خوداحافیزی بکەم.

لە روی رەسمیەوە. لەبەر ئەوەی تۆ رابەری حزبەکەمانی. بەرپرسی هەموومانی من بەنیازم دەست لە پۆستی وەزیری بکێشمەوە. ئیتر هیچ پەیوەندیەکی یاسایم بە کوباوە نامێنێت. تەنها ئەوە نەبێت پەیوەندی من لەگەڵ کوبا پەیوەندیەکە هەرگیز ناپچرێت. کە بیر لە رابردوو دەکەمەوە بروام وایە بەئەندازەی خۆم ،خۆم بەخت کرد لە پێناو سەرکەوتنی شۆرشدا. تەنها هەڵەی من ئەوە بوو درەنگ پەیوەندیم بە شاخەکانی ( سیرامایسترا) وە کرد کە ئەو کات تۆ رابەرایەتی ئەو شۆرشەت دەکرد.

راستیەکەی ئەو رۆژانەم بەشکۆوە بەرێکرد. زۆر شانازی دەکەم بەوەی لە رۆژە سەختەکاندا لەگەڵ خەم و شادی خەڵکدا بووم. زۆر کەم رویداوە کەسێك ببینم کە وەك تۆ بەتوانا و بە ئیرادەو بەهێزبێت. بەرپرسیاریەتی و بریکردنەوەکانت لە کاتی مەترسیداو، حورمەتگرتن و پێش بینیەکانت، شتانێکن لای من بیرناچنەوە.
دەبێت بڵێم بەنیازم ئەو کوبایەی کە لەگەڵ خەم و شادیەکانی و ئومێد و ئارەزوەکانی تێکەڵ بوبوم و عەشقی خەڵکەکەی بووم. جێبهێڵم. لە پیاوێك دوردەکەومەوە کە منی وەك کورەکەی خۆش دەویست. ئەمەش برینێکی قوڵم بۆ دروست دەکات. بەڵام ئیمانم بەوەیە دەبێت بچم بۆ سەنگەرێکی تر کە پێویستی بەمنە تا شۆرشێکی تر سەر هەڵبدات. دەچم بۆ پیرۆزترین کارێك، یانی دەچم بۆ شەرکردن لەگەڵ ( ئیمیریالیزم). لە هەر شوێنێك پێویست بوو برینێکی قوڵ تیمار بکەم دەچم بۆ ئەو شوێنە.
من ئیتر هیچ بەر پرسیاریەتێکم لە کوبا نەماوە. جگە لە وەی بەنیازم لە شوێنێکی تر کوبایەکی تر بدۆزمەوە. ئەگەر بریاربێت لە ژێر ئاسمانی وڵاتێکی تردا بمرم. دڵنیابە تا ئەو کاتەی دەمرم بیر لە تۆ و خەڵکی کوبا دەکەمەوە. سوپاس بۆ هەموو شتەکانت. هەوڵدەدەم ئەرکەکانی خۆم بە جێ بهێنم و تا کۆتایش وەفای تۆم لەبیر ناچێت. من هەمیشە هاوکاری سیاسەتی دەرەوەی شۆرش بووم. بۆ هەمیشەش هەروا دەمێنمەوە. بۆیە لە هەر شوێنێك شۆرشێك هەبێت من وەك وەفادارێکی ئەو شۆرشە ئامادەی یارمەتی دان دەبم.



کاتێك خێزانەکەم و منداڵەکانم بەجێدێڵم نیگەران نیم. چون دەزانم دەوڵەت ئاگای لەوان دەبێت و نایەڵێت موحتاج بن. بۆیە دەبێت منیش بە خۆشحاڵیەوە بچم بە شوێن ئەرکی خۆمدا.
قسەم زۆرە بۆ تۆ و بۆ خەڵك. بەڵام ئێرە شوێنی نیە. زۆر جار وشەش ناتوانێت هەستی من لەو بارەوە دەر برێت. هەستەکەم رەشکردنەوەی کاغەزێك سودی نەبێت.

بەهەموو هەستی شۆرشگێریەوە لە باوەشت دەگرم
یا سەرکەوتن یا مردن..

پیاوێکی وەستاو
یەکیك دەڵێت: پاڵەوان هەڵسەوە
بەڵام پیاوەکە هیچ نەجولا
دوو کەس وتیان: پاڵەوان هەڵسەوە
بەڵام پیاوەکە هیچ نەجولا
دەیان و سەدان کەس
خرۆشان و هاوریانکرد. پاڵەوان هەڵسەوە
بەڵام پیاوەکە هیچ نەجولا
هەزاران کەس خرۆشان و هاواریانکرد: پاڵەوان هەڵسەوە
بەڵام پیاوەکە هیچ نەجولا
هەموو ئەم سەرزەمینە گری گرت
فرمێسکیان رشت و هاواریانکرد"

پاڵەوان هەڵسەوە
پیاوەکە لە شوێنی خۆی قاچێکی جوڵاند
وەك بڵێی دەیەوێت ماچی هەموویان بکات
ئینجا دەست بکات بە ڕۆیشتن بۆ شوێنی مەبەست.

" هاورێت گیڤارا "



**نامەی ماڵئاوای گیڤارا:**

بۆ هاوسەر و منداڵەکانی

سڵاو .. ئازیزان

ئەگەر ناچارن ئەم نامەیە بخوێننەوە، هونەرەکەی ئەوەیە ئێوە رادەهێنێت کە من ئیدی لە ناو ئێوەدا نابم. هەڵبەتە ئەمە بۆ من زۆر سەختە. هەمیشە بیر لە بچوکترین شتی ئێوە دەکەمەوە. دەزانن باوکی ئێوە پیاوێك بوو بیرکردنەوە و هەڵسوکەوتی وەك یەك بوو. هیچ شك و گومانتان نەبێت کە باوکتان زۆر بەوەفابوو بەرامبەر ئەو شتانەی کە دەیوت و باوەڕی پێی بوون.

خۆشمدەوێن. ئەگەر بتوانن ببنە شۆرشگێرێك بۆ ئەوەی شتی باش بکەن شتێکی زۆر باشەکەن . هەتا دەتوانن هەوڵبدەن رەوشت بەرزبن خۆتان بەدوربگرن لە هەڵسوکەوتی خۆ بەزلزان. باش یەکتری بناسن. بیرتان نەچێت شۆرشکردن گرنگترین شتە و هەریەك لە ئێمەش بە تەنیا هیچی پێناکرێت،( یانی دایم پێکەوەبن: و).

گرنگتر لەمە. با هەمیشە ئەو توانایەتان هەبێت لە هەرشوێنێکی ئەم دونیایە زوڵم لە کەسێك کرا بە پیریەوە بچن و هاوکاری بکەن. ئەمە جوانترین شتە کە کەسی شۆرشگێربیکات.

بە ئومێدی یەکتر بینینەوە منداڵە ئازیزەکانم
ماچتان دەکەم و دەتانگرمە باوەش.

" باوکی خۆتان گیڤارا"

خانەوادە ئازیزەکەم

جارێکی تر پاژنەی پێلاوەکانم هەڵکێشاوەو برسی و ماندو بەشوێن ڕێگایەکی تردا دەگەڕێم.

وابزانم دەساڵ پێش ئێستا. نامەیەکی دیکەی خواحافیزیم بۆ ئێوە نارد. ئەگەر لە بیرم مابێت ئەوکات پێم وتن نە دەتوانم ببم بە سەربازێکی باش نە دەتوانم ببیم بە پزیشکێکی باش. ئەوکات زۆر خەفەتم خوارد. بەڵام تێگەیشتم کاری پزیشکی بۆ من باش نیە. وەلێ ئەمرۆ ئیتر سەربازێکی خراپ نیم.

هیچ شتێك لە ناخی مندا نەگۆڕاوە، جگە لەوەی ئێستا بەئاگاترم و ڕەگوریشەکانی فیکری مارکسیەت چووە بەناخمدا. زۆر باوەرم بەوەییە بۆ ئەوەی حەقی خۆمان وەربگرین و ئازادبین، پێویستمان بە خەباتەو ئەمە تاقة ريَطامانة .

ثيَويستمان بة جةنطاوةرية . ئێستا من جەنگاوەرم. ئەمە دوا ڕێگایە. دەبێت لە پێناوی چەسپاندنی ڕاستیەکان گیانی خۆمان بخەینە مەترسیەوە. لەوانەیە ئەمە دواکاری من بێت. من بەشوێن کۆتایی خۆمدا ناگەڕێم. بەڵام پیدەچێت ئەمە کۆتایی من بێت. ئەگەر وابێت. پێمخۆشە دوا ماڵئاوایی بکەم.

من ئێوەم زۆر خۆشدەوێن. ئەمە شتێکە کە ناتوانم ئەم خۆشەویستیەم بۆتان دەربرم. لە هەڵسوکەوتەکانمدا زۆر وشکم و هەستدەکەم هەندێکجار لێم تێ ناگەن. لەوانەیە تێگەیشتن لە من شتێکی ئاسان نەبێت. داوای لێبوردنتان لێدەکەم لەم قسەیەی کردم.



ئێستا زۆر بە ئیرادەم، ئەگەرچی زۆر بچم بەرێگادا هەناسەم تەنگ دەبێت و قاچم دەلەرزێت. بەڵام ئەمە ڕێگای منە.

جارەبەجارێکیش بیر لەم جةنطاوةری سەدەی بیست بکەنەوە.

( جلیا، روبەرتۆ، خوان. مارتین. بوتوتین، بئاتریس و هەموو ئەندامانی خێزانەکەم ماچتان دەکەم).

ئەم کوڕە هارو ها جەتان لەم دورەوە ماچی هەمووتان دەکات

کوڕی خۆتان

گیفارا

ناوەڕاستی ساڵی ١٩٦٥

**دواهەمین نامەی گیڤارا..**

سلاو هاورێیانم..

پزیشکی شتێکی ئەوەندە گرنگ نەبوو تا قسەی لە سەر بکەم و خۆمی پیوە سەرقاڵ بکەم. بەڵام لە بارەی تفەنگەوە زۆر خراپ نیم. هیچ شتێکی زیادە لە مندا بوونی نەبوو جگە لە وەی بە هوشیاریەوە فیکری مارکسیەت لە مندا ریشەی داکوتا بوو. ئەمرۆ لە و باوەرەدام شەری تفەنگ باشترین رێگا چارەیە بۆ دۆزینەوەی ئازادی. شتی زۆر لە رێگاماندایە. من تەنها فرمان جێبە جێناکەم. بەڵکو لەو کەسانەم لە پێناو ئازادیدا ژیانیان دەخەنە مەترسیەوە. لە وانەیە ئەم پەیامەی من راستی تێدابێت. نەك لە بەر ئەوەی من لە ئێوە باشتربم. بەڵکو لەبەر ئەوەی ئەم رێگایە لۆژیکی ترە. ئەگەر بەم جۆرەبێت من دەیڵێم. ئەوا بۆ دواهەمین جار باوەشتان پیادەکەم و ماجتان دەکەم. دڵنیابن من ئێوەم زۆر خۆشدەوێت. بەڵام ببورن پێشوتر نەمتوانی ئەم هەستەی خۆمتان بۆ دەرخەم..چونکە خۆتان دەزانن من لە ئیشوکارەکانمدا زۆر رژد و بەبڕوابووم، خۆشتان باش ئەمە دەزانن. هەر ئەمەش بوو وایدەکرد زۆرجار ئێوە دەرك بە شتەکانی ناخم نەکەن. بەڵام ئەمرۆ داواتان لێدەکەم بڕواتان بە من هەبێت. لەم چرکە ساتانەدا بە ئیرادەی هونەرمەندێك چێژ لە شتەکان دەبینم. قاچەکانم شکاون و توانای هەڵسانەوەم نیە. من ئیشی خۆم کرد. تکایە ئەو شۆرشگێرە بچکۆلانانەی سەدەی بیستان بیرنەچێت. مەبەستم روبرتۆ،



خوان. مارتین. پاتوتین، بئاتریس و ئەوانی تر. ماچێکی زۆر بۆ ئێوە لە لایەن منی هاورێی سەرکەش و بێ‌منەتان. ئەگەر هەڵەنەبم و باش لە بیرم بێت نزیکەی دەساڵ پێش ئێستا نامەیەکم بۆ نادرن. . ئەمجارەش ئەم نامەیەتان دەنێرم.

" هاورێتان گیڤارا "

**نامەیەکی جاك لەندەن**

بۆ: ئانا

ئانای ئازیز...

ئایا من وتم ئینسان دەتوانێت کەسێك لە ناو چوارچێوەیەکدا دیل بکات؟. زۆرباشە ئەگەر من ئەمەم وتبێت لێگەڕێ با روونی بکەمەوە. ئەم قسەیە بۆ هەموو مرۆڤەکان راست نیە. تۆ هەموو بیرەوەریەکانی منت بردووە بۆیە ناتوانم لە ناو چوارچێوەیەکدا تۆ بدۆزمەوە. ناتوانم دەرکت بکەم. لەوانەیە لافی ئەوە لێدەم لە هەڵسوکەوتی تایبەتی دە کەسدا بتوانم پێشبینی قسە و رەفتار و ترپەی دڵی نۆ کەسیان بکەم. بەڵام کە دەگەمە دەهەمین کەس ئیتر نا ئومێد دەبم. ئەمە توانای تێگەیشتن و هەستی منە. تۆ دەیەمین کەسیت.

ئایا هەرگیز دوو رۆحی یاخی و ناجۆر دەتوانن پێکەوە هەڵکەن؟. ئەمە جگەلەوەی پێکەوەبوونمان زۆرە. وەلێ هەستدەکەم لە زۆرشتدا خاڵی هاوبەش و زمانێکی هاوبەشمان نیە. قسەی هاوبەشمان نیە و دەربرینەکانمان روون نین. بێشك خودا گاڵتەی بەم زمانە لاڵەی ئێمە دێت..

تەنها عەقڵ پێمان دەڵێت لەم سەفەرەی من و تۆدا هەستێکی بەرز هەیە. ئەوەندە ئەم هەستە بەرزە هەردووکمان دەرکی پێدەکەین. وایە؟. زۆربەی شتەکان دەرك دەکەین و دەشزانین ئایندەیەکی تاریکمان هەیە. شکمان لە رۆحی یەکترییە. پێشبینی دەکەین دەبێت ئەم راستیە قبوڵ بکەین. راستی من خۆم زۆر باوەرم بەم شتانە نیە!. چوون وەك ووتم تۆ ئەو دەهەمین کەسەیت کە ناتوانم هەڵسوکەوت و هەستەکانت پێشبینی بکەم.



ئایا لە خۆمەوە قسەدەکەم؟. نازانم گوماندەکەم وابێت. ناتوانم زمانێکی هاوبەش بدۆزمەوە. راستە ئێمە سروشتێکی بەرزمان هەیە. هەر ئەمەشە وای کردوە پەیوەندیەکەمان درێژ بکاتەوە. لە ناخی هەر یەکێکماندا کۆمەڵێك چیرۆك هەیە. ئەم چیرۆکانەش رامان دەکێشن بۆ لای یەکتری و جیاوازی زۆریش لە نێوانماندا دروست دەکەن.

دەپرسم بۆچی کاتێك بە دڵخۆشیەوە دێیت بۆ لام من پێدەکەنم؟. ئەم پێکەنینە قابیلی ئەوەیە چاو پۆشی لێبکەیت. نا؟. لە راستیدا لە بەخیلیدا پێدەکەنم. من بیست و پێنج ساڵە ناخی خۆمم کپ کردوەتەوە. لە بیری خۆمم بردوەتەوە بە شەوقەوە بێم بۆلات. دەمەوێت ئەو شتە فەرامۆش بکەم، بەڵام بەروخسار پێمەوە دیار نیە. زۆر دڵخۆشم بیر لەوە ناکەمەوە تا ئەو کاتەی دەمرم هەروا بمێنمەوە. ئێستا لە دۆخێکدام فێری وانەی تازە بووم. دەتوانم لەبەر خاتری شتی بچوك شتی دیکە بهێنمە ئاراوە. بەڵام لە بەر خاتری ئەو هەموو شتە شاراوانەی کە لە ناخمدان ناتوانم دڵخۆش بم.

ئایا دەتوانم ئەم شتانەی خۆم بۆ تۆ دەرخەم؟. ئایا گوێم لێدەگریت؟گومانم نیە هەندێك لە مرۆڤەکان لە ناخەوە جوانن.من یەکێکم لەوانە...

" جاك " ١٩٠١"

**نامەیەکی ئەحمەدی شاملو بۆ:**
ئایدای هاوسەری

ئایدای نازەنین..من باشم

کاتژمێر چوارە یا چوارو نیوە، بوم و لێڵە، خەوم نەماوە، بەبۆنەی ئەو کێشە زۆرانەی کەنایەڵن بخەوم، دەبێت ئیش بکەم، ئیشێك کە بەداخەوە بۆ خۆشبەختی من و تۆ نیە. بۆخۆشم نیە. بۆ وەزیفەکەشم نیە، بۆ هیچ شتێك نیە. بۆ تەواوکردنی ئەحمەدەکەی تۆیە. بۆئەمەیە ئیتر، وەك خۆتدەڵێت جگە لە ئەحمەدەکەم هیچی دیکەم نیە. وەلیٖ لێگەرێی باشترە، ئەمشتانە هەمووی تەواو دەبن. لەکۆتایدا سبەینیٖ هی ئێمەیە، ماڵی من و تۆ و ماڵی ئایدیا و ئەحمەدە. خۆزگە بهاتیتایە. تاشەوانە تادەمەوبەیان لەتەنیشت تۆوە بە بێداری دانیشتمایە. سەرت بخستایەتە سەر سینەم و، لێگەرایتایە پێت بڵێم لە تەنیشت تۆوە چەن خۆشبەختم. چەن تۆم خۆشدەوێت. چەن پێویستم بەوەیە لەتەنیشتەوە هەناسە بدەم. چەن قسە لەدڵمایە پێت بڵێم. بەڵام بەداخەوە هەموو قسەکانمان ئەوەیە تۆ بەمن بڵێیت ( ئەمرۆ ماندویت) یان( ئەمرۆ چەند سەیر شادومانی ). منیش بەتۆ بڵێم : ( ئیتر کەی ئەتوانم بتبینم؟ ). یان تۆ بڵێت. ( دەمەوێت بڕۆم، کە تۆ باشی منت بۆچیە). منیش بڵێم. ( شێتە چەند دەقەیەکی تر دانیشە). ئیتر ئاوا. هەموو ئەو وشەو شیعرو گۆرانیانەی لە ناو رۆحی مندان بۆکوشتنی ئەم زەمانەیە. دەگۆرمەوە بە قسەو دیدارێکی پێکەنیناوی کە ئێمە دور دەخاتەوە لەترس و تۆقین.



ترس ئیتر رۆیشت، رۆیشت، ئیدی تۆو دیدارەکان و قسەکان و قولاٌی ئەوین نادۆزێتەوە. تاباڵ بگریت و خۆت لە گرفتاری و نەفرەت و پشێوی و خەمگینی دورخەیتەوە. ئەمشەو یا باشتر بڵێم ئەم دەمەوبەیانە لەتەماشاکردنی ئەم رەوشە راچڵەکیم . وازم لە ئیشەکانی خۆم هێنا تا شتێك بۆ تۆ بنوسم. ئایدای من ئەم باڵندەیە حەزی لەو قەفەزە تەنگە نیە، ئەگەربیبنی چۆن خەفەو لاڵ و بێدەنگە لەم دۆخە. لێیگەرێ فەزاو شوێنی خۆی بدۆزێتەوە، تاببینی چۆن لەتاریکترین شەوەکاندا مەیلی رۆژێکی روناکی پر لەهەتاو دەکات. بۆم بنوسە تا هەموو کاتێك و، بۆ هەمیشە گوێم لێت بێت. بۆم بنوسە تادڵنیابم تۆش وەك من هەمیشە لەچاوەروانی شەوێکی سپی دای. بۆم بنوسە تا بزانی ئەم بێدەنگیە جۆرێکە لەگرێی ژیان. لەزیندنێك ئەچێت کە موڵکی ئێمە نیە. کە ماڵی ئێمە نیە. کە شایەستەی ئێمە نیە. بۆم بنوسە لەچاوەروانی بەیانیەکدای باڵندەکەی من بێت ئاوازی ئەوین بچرێت .

" ئەحمەدی شاملۆ/٢٩ شهریوەر"

## نامەیەکی گاندی

بۆ هەمووان:

من دەتوانم باشبم، خراپ بم، خائین بم، وەفادار بم، فریشتەبم یا شەیتان . من دەتوانم تۆم خۆش بوێت یان رقم لێت بێتەوە. دەشتوانم بێدەنگ بم، زانابم یان نەزان. یانی من مرۆڤێکم ئەم هەموو سیفەتەم تێدایە... تۆش لەبیرت نەچێت ئەم شتانە بزانە:

من نابێت ئەو کەسەبم تۆ دەتەوێت. من ئەو کەسەم کە خۆم دەمەوێت، من دەبێت ئەو کەسەبم کە خۆم دەمەوێت دروستی بکەم، تۆ گەر بەنیازبیت بە ئارەزووەکانت من بجوڵێنیت ئەوە نابێت. بیرکردنەوە و ئیشکردن، خۆشی دەدات بە ژیانی مرۆڤەکان نەك ئارەزووەکان. من مەجبور نیم ئەو کەسەبم کە تۆ دەتەوێت. تۆش دەتوانی هەڵبژێریت منت دەوێت یان نا؟!.. بەڵام بیرت نەچێت ناتوانی بریاربدەیت کە دەبێت من چۆن بم.

دەتوانی خۆشت بوێم بەو جۆرەی کە هەم. دەشتوانیت بێزاربیت لێم بە بێ‌ئەوەی شتێکم کردبێت، بەهەمان شێوە منیش ئەوە دەتوانم. دەزانی بۆ؟ چونکە هەردوو کمان مرۆڤین. ئەم دونیایە هی مرۆڤەکانە. بەڵام ئەم دونیایە هی ئەوانەیە هەستیان جوانە. تۆ ناتوانیت خۆت بسەپێنی بەسەرمنداو خۆت فەرزکەی بەسەرمدا. منیش هەروەها. تەنها خودا دەتوانێت باڵا دەست بێت بەسەر هەمووماندا.



هاورێیانم..

من بەم جۆرە خۆم پەروەردەکردوە. حەسودەکانم خۆش ناوێن، بەڵام حەزدەکەم ئیدی حەسود نەبن. دوژمنەکانم کەیفیان بەوە دێت نابوتم کەن بەڵام نەیان توانی. بیرتان نەچێت ئەگەر من حەقی ئەوەم نەبێت ستایشم بکەن مەیکەن. بەهەمان شێوەش حەقی ئەوەم نەبێت خۆشتان بوێم خۆشتان نەوێم. تکایە نە حەسودبن، نەدوژمن. نە چاودێر بەسەرکەسەوە. من لایەق بە ستایشم و تۆش بەهەمان شێوە. بیرت نەچێت ئەگەر چاوت بەم نوسینەی من کەوت، هەموو رۆژێك بیخوێنەوە و بیهێنەوە بیری خۆت. هەموو مان مرۆڤین. شتی تایبەتی خۆمان هەیە. دەبێت یارمەتی یەکتر بدەین. بە هوشیاریەوە مامەڵە لەگەڵ مرۆڤەکان بکە. مرۆڤ شایەنی رێز و ستایشە. بیرت نەچێت ئەمە باشترین کلیلی دەرگاکانی ژیانە..

" ماهاتما گاندی "

## نامەیەکی بتهۆڤن بۆ ئازیزەکەی

فریشتەی من..

ئەی هەموو هەست و بوونم، گیانی گیانانم، ئەمرۆ چەن وشەیەکت بۆ بنوسیبامایە، تاسبەی خوا گەورە بوو، ئەریٚ‌ئەم هەموو نائومێدیە چیە.! بۆچی ئەم هەموو خەفەت و خەمە لەناو بونماندا هەیە؟. ئایا عەشقی ئێمە ناتوانیٚ‌بەبیٚ‌قوربانیدان بەردەوامی بەخۆی بدات؟. بەبیٚ‌ئەمە هیچی ترمان پێناکرێت؟. ئایا دەتوانیت ئەم رەوشە بگۆریت. من هیچ قسەیەکی ترم نیە. بەلاٚم تۆ پێدەچێت نەتوانیت هیچ شتێك بکەیت بۆ من. چەن قسەیەکی خەمگینە. لەناو جوانی سروشتدا بەشوێن ئەوینێکی راستەقینەدا بگەرێی تابگەیتە ئاسودەیی. ئەوین هەبێت یا نەبێت هەر تۆی دەوێت و حەقی خۆشیەتی تۆی بوێت. چیرۆکی ئەوینی من و تۆ بیٚ‌قەراریە. ئەگەر بەم شێوەیە بروا. ئیتر باکم بەئازاری رۆیشتنیش نیە. لێگەریٚ‌با لەم دونیا بیمارە دورکەوینەوە و کەمێك بۆخۆمان بژین، بیٚ‌گومان لەم رۆژانەدا خەونێکم دی، بەلاٚم ناتوانم لەم نامەیەدا هەموو ئەو شتانەت بۆبا سکەم کە لەرۆژانی رابردودا بەسەرم هاتووە، ئەگەر لەلام بویتایە ئەم شتانە نەدەهاتن بەسەرمدا. قسەی زۆر لەدڵمایە کەبە تۆی بڵێم. ئای برێکجار هەستدەکەم قسەکردن بەس نیە. هەرباشبی، ئەی تەنیاترین پەناگەی من. ئەی هەموو هەستی من.

بیٚ شك خودا ئارامی بەئێمە بەخیشوە. من دانی پێدا دەنێم ئەمە باشترین دیاریە بۆ ئێمە



## نامەیەکی تاگوور

بۆ هاوسەرەکەی:

سڵاو ئەی ژیانم..

وەرە..

وەرە.. بەو جۆرەی کە هەیت بەبیٚ‌خۆ رازاندنەوە وەرە... پەلکەکانت مەگرەوە، لێگەریٚ‌با قژت شێواو بێت. دڵتەنگ مەبە و ئاوا وەرە..

وەرە بەو جۆرەی کە هەیت ئاوا وەرە، خۆت سەرقاڵ مەکە بە خۆرازاندنەوە با درەنگ نەبێت دەی وەرە..

چیمەنەکانم بریوە تا خێرا بێیت. ئەگەر مرواریەکانت کردە گەردنت و لە رێگا ون بوون. بۆیان مەگەریٚ‌و دڵتەنگ مەبە بادوا نەکەویت.. زوو وەرە.

بە خێرایی بەناو کێڵگەکاندا وەرە.

نابینی هەور ئاسمانی دا پۆشیوە؟

لە بەیانیەوە هەموو باڵندەکان چاوەرێن تا تۆبێیت ئینجا بفرن. با بەسەر چیمەنەکەدا راکشاوە هەر ئەوەندەی ماوە بگریت بۆت.

چراکەی روخسارت دامەگیرسێنە، نەبادا لێرە با بیکوژێنێتەوە. کێ‌دەتوانێت تۆ ببینێت و بە تیری موژگانت بیمار نەبێت. کێ‌دەتوانێت لەژێر ئەو ئەبرۆ رەشانەتەوە کە لە هەوری ئاسمانەکان رەشترن خۆی بگرێت و تەڕنەبێت.

ئەگەر تا ئێستا گوڵەکان نەگەشابنەوە بۆ بەرپێت هیچ روودەدات؟ خۆت لە بەر ملوانکە ئاڵتونیەکەت دوامەخە با ئاسمان دڵی نەرەنجێت. با درەنگ نەکات خۆت چۆنی ئاوا وەرە.. دەی وەرە..

بەس وەرە و هیچی تر..



**نامەیەکی: فرانتس لیست..**

بۆ: ماری هاوسەری..

دڵی من سەرشارە لەهەست و شادی.

نازانم بەچ هەستێکی ئاسمانی. بەچ چێژێکی بێ‌کۆتایی کلپەی ئاگرەکەی ناخمت بۆ دەرخەم. تائێستا بەوجۆرە ئەویندار نەبوم!. پێم بڵێ‌ئەم هەموو خۆشیە چیە دەیدەی بەمن. بۆنمونە هەستەکەم لەتەنیشت شادیەوە دانیشتوم. ئەم هەموو لەرزینە ئاسمانیەی عەشق لەکوێوە دێت؟!. ئای . تۆ خوشکی، فریشتەی. ژنی. هەموو ئەمانەی بۆ من. هەڵبەتە جگە لە ئاگری تۆ لەناخمدا هیچی ترنیە. بەڵام برێك جار بەنهێنیەوە فرمێسکێك لەچاوەکانمدا دێتەخوار..

خودایا رەحم بەئێمە بکەو، هەرگیز لەیەکمان جیامەکەرەوە. ئەوە چی دەڵێم؟!. بمبورە گەر ئیمانم لاواز بوبێت. دەزانم تۆ هەرگیز ئێمە لەیەك جیاناکەیتەوە.. خوداوەندا تۆ جگە لەرەحمەت هیچ بەسەر ئێمەدا نابارێنی. نانا بێ‌هۆنیە رۆح و گیانم پەنا بۆتۆ دەبەن و قسە لەگەڵ تۆدەکەن. باوکە وشەکانی تۆ لەناخی ئێمەدا قوڵپ دەدەن. باوکە. دەستی ئێمە بگرەو دڵە شکاوەکانمان تیماربکە. ئای شوکر بۆتۆ کە ئەم هەموو شتە جوانەت بەئێمەدا و رێگای جوانت پیشانداین. شوکر بۆتۆ، من هەمیشە ستایشت دەکەم.. ئامین ئامین...

ماری ماری ..

لێگەڕێئەم نامەیە هەزاران جار دووبارە بخوێنمەوە. سێ‌ڕۆژە ئەم نامەیە لەناخمدایە. ئیتر بەرگەم نەگرت لەو گەرمایەی ناخم و نوسیم. من نامە بۆتۆنانوسم. خۆتدەزانی قسە بۆتۆدەکەم، چون تۆ هەمیشە لەنزیکمەوەیت. دەوبینم و بانگت دەکەم.. ئەبەدیەت لەناو باوەشی تۆدایەو، بەهەشت و دۆزەخیش هەروا. هەمووشت لەتۆوە دەست پێدەکات و لەتۆوە دەنگی لێوە بەرز دەبێتەوە. لێگەڕێ با هەمیشە لەخۆشیدابم و، دوربکەومەوە لەم جیهانە تەنگە. دەبێت لەبادەی ژیان بنۆشم تا ئاوادەبین. ئەوین هەرشتێك بێت قبوڵمە، بروادەبکە کاتێك بەتەنیشتدا تێدەپەرم. پاکی و دڵخۆشی روم تێدەکەن. لێگەڕێ با ئەم چیرۆکە تەواو بکەم. تۆ پری لەسادەیی و میهرەبانی. لێگەڕێبا دێوانەو مەست بم. جگە لە تۆ هیچ شك نابەم. خۆزگە ئێستا دەم توانی قسەت لەگەڵ بکەم... خۆزگە دەمتوانی..

خوزگە...

" فرانتس لیست"

" ١٨٣٤ "



**نامەیەکی خانم فرانسیس ئان**

بۆ باتلەری ئازیزی ...

.......

ئەوەندە عاشقت بووم پێمخۆشە ژیانم بکەم بەفیدای تۆ، هەڵبەتە ئەو کاتەی کە ژیانم بۆئەوە بشێت فیدای تۆی بکەم. تۆ پایەی ئومێدی بۆمن و هەمووئەو شادی و خۆشیانەی لەسەر ئەم زەمینەن لەرێگەی تۆوە بەدەستیان دەهێنم. دەبێت بزانیت هیچ کەسێکم هێندەی تۆ خۆش ناوێت. روبەرو بونەوە لەگەڵ تۆ بۆمن هەرگیز وەك خەڵکی ترنیە. بەشێوەیەکی گشتی زۆر مەحاڵە کە رۆژێك بێت من دڵساردی بنوێنم بەرامبەر بەتۆ... هەموو ئامانجی ژیانی من ئەوەیە لەگەڵ تۆدا بژیم. هەموو بیرکردنەوە و خەیاڵ و ئەوینم بەتۆیە. ئیتر هەرگیز ناتوانم فەرامۆشت بکەم. ئەوکاتەی تۆ ئەوینی من و هاوسەری من و باوکی منداڵەکانی من بویت. هەرکاتێك کە سەیرم دەکردی نەمدەتوانی لەنیگاکانمدا میهرەبانی و خۆشەویستی دەرنەبرم. هێشتا دەنگی تۆیە ترپەکانی دڵم دەجوڵێنێت و هێشتا دەنگی تۆیە. لەناو دەمارەکانمدا خوێنەکەم وەجۆش دێنێت...

" فرانسیس ئانا__ ١٨٢٢"

- فرانسیس ئان. یەکێکە لەخانمە شاعیرەکانی سەردەمی شکسپیر. لەگەڵ باتلەر خۆشەویستی دەکرد و پاشان شوی پێکرد. بەڵام پاش ماوەیەك لەیەك جیابونەوە و ئیدی سەرقاڵی کارەکانی خۆی بوو. فرانیس لەساڵی ١٨٠٩ لە لەندەن لەدایك بوو. لەساڵی ١٨٩٣ کۆچی دوای کردوە...
- تابلۆکە لەسەر شێوە فرانسیس کێشراوە، بەڵام نازانم چ هونەرمەنێك ئەم تابلۆیەی کێشاوە.



**نامەی یەکەمی فروغ بۆ پەرویز شاپور**

پەروێز حەتمەن چاوەڕێی جوابی نامەی ، من هەستم دەکرد بەدیعەخانم هەمووشتێکی لای تۆ باسکردوەو . ئیتر پێویستی بە دووبارە کردنەوە نەدەکرد. بەڵام لەلایەکی ترەوە هەموو بیرکردنەوەکە ئەوەیە دەشێت تۆنەزانیت ئەو بڕیارەی کەداومە بەرابمەر بە هەڵبژاردنی تۆ بەئاسانی بەئاسانی نایەتە دی. من نامەکەی تۆم خوێندەوە ڕاستە من چاوەڕێی شتی وا لەتۆ ناکەم. بەڵام لەبەرخاتری تۆ ئەم ڕێگایە دەگرمە بەر و هەمووان ڕازی دەکەم. لەو بارەیەوە خەیاڵت ئاسودەبێت. تۆ بەتەلەفۆن بەمنت وت. ڕۆژی دیاریکراو ڕۆژی هەینی یە. بەڵام باشترنیە بڕیار بدەیت کەمێك زوتر کارەکان جێبەجێ بکەیت . چون تەنها ٥ ڕۆژمان لەپێشە بۆ هەینی. من ناتوانم لەو ماوە کورتەدا ئەو هەموو ئیشانە بەتەنیا ئەنجام بدەم. هەموو وەڵامی من ئەمەیە
ڕازیم. ڕازیم. چاوەڕێی هەنگاوەکانی تۆم.
خودا حافیز.......... فروغ

## نامەی دووهەمی فروغ بۆ پەروێز شاپور

پەرویزی خۆشەویستم. ئەزانی بۆچی دوبارە ئەم نامەیەم نوسیەوە. چون دوای ئێوارە چەن سەعاتێك پێش خەو. لەگەڵ دایکم قسەم کرد. ئەمەوێت بڵێم نەتیبجەکە ئەوەیە بە تەواوەتی رازی بوون . بەیانی نامەیەکم نوسی و ئێستاش دەمەو عەسر ئەم نامەیە دەنوسم و، ئیشەڵا بەیانی هەردووکیت بۆ پۆست ئەکەم. بەڵام لەنێوان نامەی بەیانی و عەسر تا ئەندازەیەك بۆچونی ناکۆکی تێدایە. چونکە بەیانی ئومێدەوار نەبوم . بەڵام ئێستا دەمەو عەسر زۆر ئومێدەوارم و ئیتر ئەتوانم تۆ بەدەست بهێنم. پەروێز من لەگەڵ دایکم. لەبارەی تۆوە زۆر قسەم کرد. ئێستا دایکم تا ئەندازەیەك لەبارەی من و تۆوە باوەرێکی بۆ دروست بوەو، لەبارەی نارازی بوونی تۆوە لەسەر مەرجەکان بۆم رونکردەوە، ئەو قەناعەتی کردەوە. تەنها شتێك کەماوە مەسەلەی خەرجی و گرێبەستەکەیە، لێمگەرێ با بۆتی بژمێرم تا بزانی چەند خەرجی تێ دەچێت. چەن پارەت پێویستە. پەروێز من دەمەوێت کراسی بوکێنیەکەم خۆم بیدورم. لەبەر ئەوەی بەرگدورەکان ناتوانن بەوجۆرە بیدورن کەمن حەزم لێیەتی. ئەو پارەیەی دەیدەم بە بەرگدورەکان. یانی ١٠٠ تا ٢٠٠ تومەن. ئەتوانم لە سندوقێکدا هەڵیگرم بۆ شتی تر خەرجی بکەم. من بیر لە قیمەتی کراسەکەش ناکەمەوە. ١٠٠ تومەن تا ٢٥٠ تومەن بۆ کرینی شیرنی و ئەو شتانەش. ( هەڵبەتە ئەگەر زۆرە پێم بڵێ بامنیش رەچاوی بارو دۆخی تۆبکەم). ئەمەش ١٠٠ تا ١٥٠ تومەنی بۆشتی تر. یانی رۆژی یەکەم بەلانی زۆرەوە ٥٠٠ تومەن یان ٤٠٠ تومەنی دەوێت. پەروێز دەبێت تۆ ئەم پارانە پەیدا بکەیت.



ئەگەر ناتوانی پێم بڵێ بامن بیربکەمەوە چ شتێك پێویست نیە بیخەمە لاوە. تا بەئەندازەی توانای تۆبێت. بۆچونی خۆتم لەم بارەیەوە بۆ بنوسە. دەمەوێت پێت بڵێم باوکم ئەمرۆ یان سبەی دێت. نازانم بابەتەکەی بەیانی چیە. وەلێ دایکم بەمنی وت بەتۆ بڵێم نامەیەك بۆ ئەو بنوسە. بیدە بەمن. من دەیدەمە ئەو بیداتە باوکم. دایکم بەڵێنی پێداوم. هەرکە هات بەزوترین کات لەبارەی من و تۆوە قسەبکات و هەموو هەوڵێك دەدات بۆ رازیکردنی. دڵنیام کە رازی دەبێت. پەروێز دەبێت لەبارەی گرێبەستەکەمانەوە بنوسیت و بۆنمونە بڵێیت. من لەروی مادیەوە ئامادەم و تەحەمولی هەموو ئەو شتانەدەکەم دەکەونە سەرشانم و بەزوترین کات ئەو کارانە ئەنجام دەدەم. وە بنوسیت. ئەگەر من ئامادە نەبووم ئەوا تۆ ئامادەی هەمووشت بکەیت. ئەمەوێت ئیتر ئەو مەجالی ئەوەی نەبێت رەدی بکاتەوە. واهەست ئەکەم ئیتر دۆخی ئێمە روناك بوەتەوە. ئەمشەو دوعام کرد خوا تۆ سەلامەت بکات و لەخوا ئەپارێمەوە دڵی بەمن بسوتێت. چیتر لەچاوەروانیدا دام نەنێت. تۆش دوعابکە دوعاکردن زۆر باشە.

من هەمیشە داوای یارمەتی لەخودا دەکەم و تۆش هەروا بکە. ئەزانم باشەبیت.

خوا حافیز .

فروغ

## نامەی سێهەمی فروغ بۆ پەروێز

پەروێزی خۆشەویستم

من نازانم بە چ شێوەیەك داوای لێبوردن لەو گوناهەی خۆم بكەم. ئەمە خراپترین شتێك بو تا ئێستا كردبێتم. بەڵام خەتای من نەبوو. لەئاخر دەقەدا كە ویستم لەگەڵ دایكم سەر لە تۆ بدەین. میوانمان هاتو ناچار بوین لەماڵەوە بمێنینەوە. من یەك دونیا داوای لێبوردن لەتۆ دەكەم. كە زۆر چاوەروان بویت. بمبورە و، ئومێدەوارم لای تۆ جێگای بەخشین بم. دەمەویست شتێك بە تۆ بڵێم، پێش ئەوەی بچیت بۆلای باوكم و یەكتر بناسن. بەڵام بەداخەوە بۆم نەكرا. ئەم نامەیە لەرێگای فەرەیدونەوە دەنێرم بۆت. ئەو بۆت باسدەكات میوانەكانی ئێمە چ كەسانێك بوون و، بۆچی ئێمە نەمان توانی بێین.

خواحافیز

فروغ



## نامەی چوارەمی فروغ بۆ پەروێز

پەروێزی ئازیز..

لەكاتێكدا ئەم نامەیەت بۆ دەنوسم، یەك دونیا خەم فشاری هێناوە بۆ رۆحم. من لەدوێنێوە تائێستا فرمێسك دەرێژم، هەستەكەم جگە لەگریان چارەیەكی ترم نیە. پەروێز ئەگەر بڵێم خراپترین و بەد ئاكارترین خێزان لەدونیادا وەك خانەوادەكانی ئێمە بونی نیە درۆناكەم، ئەمانە خۆیان مەلاس دەدەن تاشتێك روبدات ئینجا خۆیانی پیادەكەن تا نێوانی دووكەس تێكبدەن و ئاسودەی دوكەس بشێوێنن. من هەمیشە دژی ئەم جۆرە ئاكارانەبوم. هەموو كێشەكەش ئەوەیە دەیانەوێت رەنجی دووكەس بدەن بەئاوا.

پەروێز كە نەواب خانم هات بۆماڵمان، مەرجەكانی تۆو دایكی بەدایكم وتبوو، دایكم ئێستا زۆر نائومێد بوە لەتۆ و منی والێكرد بۆخۆم بگریم. پەروێزم.. من ئیشم بەراست و دروستی ئەو پەیامە نیە. بەڵام بۆئەوە دەگریم كە دوێنی دایكم پێی وتم" یادەبێت دایكی پەروێز رازی بێت یان من تۆ نادەم بەئەو". پەروێز .. ئەم قسەیە ئاگری لەمن بەرداوەو دەمەوێت هاواربكەم. بەڵام بە بێدەنگی دەگریم، چون خۆمەزانم چەن بەدبەختم، سەیركە چیم پێدەڵێت. بەمن دەڵێت تۆ فەرامۆش بكەم. ئەمە لای من قبوڵنیە. من تۆم خۆشدەوێت و یەك دونیا ئومێدوئارەزوم هەیە لەگەڵت.

من بۆیە زیندوم تا لەگەڵ تۆ بژیم، تۆ لەشوێنی ئازیزترین کەسمی. من بەدڵ خۆشم دەوێیت. حەقی خۆمە بگریم.

سەیرکە چیان بەدایکم وتوە. لەوەختێکدا ئەو یەك دونیا موحیبەت و میهرەبانی هەبوو بۆتۆ. ئێستا بەتەواوەتی گۆراوە بەرابمەرت. پەروێز من تەنها ئەو بەشەت بۆئەنوسم کە بەدایکمیان وتوە، پێیان وتوە دایکی تۆ بەم هاوسەرگیریەی من و تۆ نارازیە، وەختێك زانیویەتی شتێکی واهەیە لەبەینی من و تۆدا تورەبوە لەتۆ. گوایە تۆ هەشت ساڵە کچێکت خۆشدەوێت و ماوەیەك بەرلە ئێستا شویکردوەو ئێستا جیابوەتەوە و چاوەرێیە لەگەڵ تۆ هاوسەرگیری بکات... من ناتوانم بەر بەفرمێسکەکانم بگرم چون ئەمە جێگەی بروانیە. ئەگەر ئەمە راست بێت ئیتر باوەرناکەم تۆ هیچ عەشقێك لەدڵتدا بوبێت بۆمن. پەروێز ئەگەر وایە تۆ ئەتوانی لەگەڵ ئەودا خۆشبەختبیت و من هیچ قسەناکەم و تۆ لەبیردەکەم. بەڵام دڵنیابە ئەو فەرامۆشکردنەی تۆ بەگیانی من تەواودەبێت. بامن بمرم ئینجا دەزانی بەیەکجاری لەبیرم کردویت. من بەبیٕتۆ ناتوانم یەك سات بژیم. ئێستا لەهەمووکات زیاترخۆشم دەوێیت و جگە لەتۆ ناتوانم کەسیترم خۆش بوێت. پەروێز.. دەبیٕتۆببینم و لەهەمووشت تێبگەم، تۆش وەرە بۆلای باوکم و جوابی یەکجاری وەربگرە. دڵنیام من بەم حاڵەوە بڕۆم ئیتر لە بونمدا هیچ شتێکم نامێنێت جگە لەئەوینی تۆ. چاوەرێی تۆم لەگەڵ دایکت هەوڵبدەی رازی بکەیت، من دڵنیام لەباوکم، ئەو زۆر گویٕبەو شتە بچوکانە نادات، بەڵام ئەوەتەنها دایکمە مەجی رازی بونی دایکتی



کردوەتە بیانوی هاوسەرگیریەکەمان. تۆ دەتوانی بە لۆژیکی بەهێزی خۆت ئەو قەناعەت پێبکەیت.

پەروێز من حەزەکەم ببمە هاوسەری تۆ. ئەم شتانە بچوکترین کاریگەری لەسەر خۆشەویستیمان ناکات. بۆچی دایکی تۆ منی خۆش ناوێت. ئاخر من چ خراپەیەکم بۆئەو هەبوە. ناتوانم باوەربکەم دایکت تا ئەو رادەیە رێگری لە ئاسودەیی تۆ بگرێت . پەروێزی من فەرامۆش مەکە من ناتوانم تۆ فەرامۆشبکەم. فەرامۆشکردنی تۆ لەجێی مەرگی منە. ئێستاش بیر لەو شەوە دەکەمەوە چوین بۆ سینەما. برێکجار بیرکردنەوە لە قسەخۆشەکانی تۆ زۆر شتم لەبیردەباتەوە. خۆزگە ئەو شەوانە دوبارە دەبونەوە و دەمتوانی لەتەنیشت تۆدا بەئاسودەی بژیامایە. پەروێز. دەبێت هەرچیتکردبێت لەگەڵ دایکم قسەبکەیت. هەرچیم کردبێت بەبیانوێك رۆژی پێنج شەمە یان هەینی بلیتێکی سینەما دەکرم بۆئەوەی تۆ مەجالێك بدۆزیتەوە قسەلەگەڵ دایکم بکەیت. ئەمرۆ بەجۆرێك ئازاری دام حەزم دەکرد بمرم و ئیتر ئەوەندە هەوڵنەدەم. بەڵام لەبەرخاتری تۆ بەرگەی هەمووشت دەگرم. من خۆم ئامادەکردوە بۆشتی گەورەتر و ئەم شتانە زەرەیەك کاریان لە ئەوینی من نەکردوە بۆتۆ. پەروێز من لەشوێنی تۆبومایە پێش هەمووکەس دایکمم رازی دەکرد. هەوڵبدە لەگەڵی و بۆچونەکانی بگۆرە. من زۆر دایکتم نەدیوە تا قسەی لەگەڵ بکەم بەڵام خۆشم دەوێت. لەوە سەرم سورماوە بۆچی ئەو رێگری لە خواستی تۆدەکات. پەروێز من تۆم بەیەك دونیا ئەمێدەوە خۆشدەوێت. تەنها داوام

لەخوا ئەوەیە تۆ خۆشبەخت بیت. من لەدوێنێوە تائێستا فرمێسك دەرێژم. توشی حاڵەتێکی سەیربووم. ئەمما ئامادەم بەرگەی هەمووشتێك بگرم تا لەگەڵ تۆدا خۆشبەخت بم. پەروێز تۆ سەر سەخت و خاوەن باوەربە، تادەتوانی فشاربخەرە سەرباوکم، ئەو خەڵکی هارو سەرسەختی خۆش دەوێت. بەو شێوەیە نیە کە واخۆی دەردەخات قسەکانت گرنگ نین. من زۆر نیگەرانم لەوەی دایکم پێشوتر بۆئەوەندە میهرەبان بوو لەگەڵ تۆو بۆچی وا گۆڕا، نازانم لەژێر کاریگەری کام قسەی ناراستدا بوە ئاوا بۆچونی لەسەرت گۆڕا. بەڵام دڵنیام تۆ بەو لۆژیکەی خۆت دەتوانی ئەو بۆچونە لاوازەی ئەو پێچەوانە بکەیتەوە. پەروێز.. من یەك شتم لەتۆدەوێت دایکت و دایکم رازی بکە. هەڵبەتە کاتیٚ‌دایکت رازی بوو ئیتر دایکی منیش رازی دەبێت، جوابی نامەکەم بۆبنوسەو بیدە بەفەرەیدون بۆم بێنێت. من چاوەری تۆم. تاخودامان هەبێت کەس ناتوانێت خۆشبەختی من و تۆ تێکبدات. من تەنها داوا لەخودا دەکەم من و تۆ خۆشبەختبکات و ئەم کێشەیە چارەسەربێت. پەنا بەخودا ببە ئەو بەپیرمانەوەدێت

خوداخافیز پەروێزم ... فروغ

پەروێز... یەك داواکاری بچوکم لەتۆ هەیە. بیرم چوو بینوسم. وێنەیەکی خۆتم بۆبنێرە و لەپشتیشی شتێك بنوسە. بیخە ناو نامەکەوە با فەرەیدون بۆم بێنە. بێخەم بە جگە لەمن کەسیتر نایبنینێت. ئەم داوایەم قبوڵ بکە.
فروغ



**نامەیەکی :**
**ڤۆڵتێری فەیلەسوف بۆ خۆشەویستەکەی**

سڵاو...

خۆتدەزانی پاشاکەی ئێمە منی لێرە زیندانی کردوە، دەتوانێت خۆم و گیانم زیندانی بکات، بەڵام هەرگیز ناتوانێت عەشقی من بۆتۆ زیندانی بکات. ئەریٚ‌عاشقە جوانەکەی من ئەمشەو لەخەودا تۆم بینی. تکا ئەکەم ئەگەر سەریشم بە شمشێر بپەرێنن باشترە لەوەی تۆ ئەو نامە خەمگینانەم بۆ بنێریت. تۆدەبێت خەفەت نەخۆیت و ژیان بکەیت. ئاگات لەخۆت بێت و ئاگاشت لەدایکت بێت چون دوژمنێکی باشە بۆمن و تۆ. ئەزانی چۆن؟ ئاگات لەهەموو کەس بێت. بڕوا بە هیچ کەس مەکە. خۆت ئامادە بکە بۆسەفەر. کەمانگ هەڵهات بکەوەرە ڕێ. من لێرە کەس ناناسم باکم بەکەس نیە. وەك با وام تەنها ئەو شتانە دەبینم دێنە ڕێگەم. خۆم لێرە پارچە کاغەز کۆدەکەمەوە و ئەم نامانەی پێدەنوسم بۆتۆ. ئەگەر منت خۆشدەوێت دووبارە بەڵێن بەدڵت بدە و هەموو خەیاڵ و بیرکردنەوەکانی خۆت بخە گەر. ئاگات لەدایکت بێت. پاشان هەموو وێنەکانت لەگەڵ خۆت بهێنە و دڵنیابە ترس و ئەشکەنجە هیچ دیدی من بۆ تۆ ناگۆڕێت. هیچ شتێك ناتوانێت من لەتۆ جیابکاتەوە. عەشقی ئێمە عەشقێکی پاکەو تا ماوین دەستی لیٚ هەڵنگارین. بەبیٚ‌هیچ شتێك ئامادەم لەپێناوی تۆ هەمووشتێك بکەم. تۆ شایەنی هەمووشتێکی.
خواحافیز ئازیزی دڵم.

**نامەیەکی نیما یوشیج:**

بۆ عالیەخانی هاوسەری..

ئەزیزم..

دڵی من بەرەو تۆ دەفرێت...

بمبورە لەگەورەی ئەم خۆشەویستیەم. لەو هەموو ئازارەی کە روبەروی تۆم کردوەتەوە. ئەزیزم چاوپۆشی لەهەڵەکانم بکە. سەرسام نەبیت لەوەی کەسانێك هەن دڵیان وەك ئاو ئاگر هەڵسوکەوت دەکات. برێکیش هەن دڵی خۆیان ناپەرستن و هەموو شتەئاسایەکانی سروشت و ئیرادەی خۆیان لەناو دڵیاندا سریوەتەوە. وەلێ من بەپێچەوانەی ئەوانەوەم. هەرچی شتێك قەدەر و سروشت بۆمنی بهێنێت بەدڵ و گیان وەریدەگرم. ئێستا بە پێداگریەکی سەختەوە ماوەیەکی زۆرە بیر لەوەدەکەمەوە بەنیازی ئەوەی دڵم بەرەو تۆ بفرێنم. .چون بەراستی منت دیل کردوە.

حەزم لەرەنگی سورە، وەك گوڵمەکانی تۆ. یان لەرەنگی رەشە وەك پرچەکانی تۆ. تابێم لەکەناریانەوە دانیشم. من بابایەکی کێوی و ناشارستانیم. یابڵێم نوسەرێکی گومنامم، کە هەمووشتێکم پێچەوانەی خەڵکەو هەموو ئیرادەو، بیرکردنەوەی من بۆتۆی گوندیە. تۆش ئاگات لەبەرخەکان و مریشەکان بێت...

پێم وتی بە چ شێوەیەك تۆم دەوێت. یانی گەورەتر لە تێڕوانینی خۆت و و باشتر لەهەستی خەڵکیش. ئەما هەی هات بەختی رەشی من لەم دونیایە. نایەڵێت بگەم بە ئومێدی ئارامی تۆ. لێرە لەناو خەیاڵێکی



تاریکی ترسناکدا. وەك سەرنشینێکی دۆڕاو دانیشتوم سەیری بەدبەختی خۆم دەکەم.

دۆستی کێو نشینی خۆت

نیما

- نیما یوشیج. یەکێکە لە شاعیرە گەورەکانی ئێران. کە شیعری ئێرانی بەرەو نوێگەری بردو تائێستاش شیعری ئێران لەژێر هەیمەنەی ئەو تازەگەریەی نیما بەرێوەدەچێت.

**نامەیەکی ڤیکتۆر هۆگۆ: بۆ ئازیزەکەی**

ئازیز..

لەبیرت دێت ئەمرۆ ساڵێك تێپەریوە بەسەر یەکتربینینی من و تۆدا؟. شەوی ٢٦ ئەپرێلی ١٨١٩ لەتەنیشت یەکەوە دانیشتبوین، بەدڵ وبە گیان قسەمان بۆیەکتری دەکرد. بەدڵێکی گەرمەوە، باسمان لە ئەوینێکی بێکۆتایی دەکرد. تۆش زۆر بەسادەیی پەردەی ئەوینت لادا، هەستێکی زۆر خۆشم هەبوو. دڵم ئاسودەبوو. هەموو شادی و خۆشیم ئەوەبوو زانیم کەسێك منی خۆشدەوێت. توخودا پێم بڵێ‌ئەو شەوەت لەبیرنەکردوە؟. پێم بڵێ‌ئەو شەوەت لەبیرماوە؟. هەموو شادی و خەمی من هەرئەو شەوەیە. ئەوە بۆساڵێك دەچێت ئەوشەوە دووبارە نەبوەتەوە. ژیانێکی خەمبار و پڕ رەنجم بەسەر برد. بەڵام ناتوانم چیرۆکی دڵی خۆم جگە لەتۆ بەکەسی تر بڵێم. لێمگەڕێ‌باوابم.
ئێمە خێزانێکی ئەویندار بووین. کەچی داواتکردت ئیتر هیچ شتێك نەڵێم، چەن خەمگین و پەرێشانم. بەبێدەنگ ئەچمەوە ژوورەکەی خۆم و بەتەنیا پڕ بەدڵی خۆم دەگریم. یەکەمجار دەمەویست بەرەو مەرگ بچم، وەلێ‌هەرزو روخساری جوانت هاتە پێش چاوم، وتم دەبێت لەپێناو ئەوینی تۆدا بمێنم. بەناچاری بەیادی ئەو رۆژە خۆشەوە گریام. بەبێ‌تۆ ژیانی من لەمەرگێکی قورس ئەچێت. ئێستا بۆ هەر شوێنێك دەچم، هەر ئیشێك دەکەم و سەیری هەرچی دەکەم، تۆدێیتە پێش چاوم. ناتوانم یەك چرکە فەرامۆشت بکەم. ئومێدەوارم کە ئەم نامەیەت خوێندەوە دڵتەنگ و خەمبار نەبیت.



زۆر خۆشحاڵ دەبم ئەگەر تۆش لەسەر خۆشەویستی نێوانمان شتێکم بۆ بنوسی. ئەمرۆ بەیانی و ئێوارەش تۆم بینی، بەهیوام بتبینمەوە. چون ئەوە ساڵێك تێپەری بەسەر ئەوین و یەکتر بینیماندا. ناکرێت لێگەڕێین ژیان بەبێ‌ئەو شادیانە تەواو ببێت. ئەم بەیانیە جورئەتی ئەوەم نەبوو قسەت لەگەڵ بکەم چون تۆ پێت وتم تا ٢٨ مانگ نابێت هیچ بڵێم، هەرچەن ئەو فەرمانەی تۆ من زۆر ئازار دەدات. بەڵام رێزم هەیە بۆ بریار و فەرمانەکەت . بێ‌فەرمانی تۆناکەم.
ئێستا درەنگی شەوە. تۆ ئێستا بەبێ‌خەم لەخەوێکی نازداردایت. نازانی کە منی وەفادارت هەمووشەو پێش خەوتن. چەند تاڵە موێکی پرچت بەنەرمی دەخەمە سەر لێوم و بە جوانی ماچیان دەکەم.

**نامەیەکی عومەری کوڕی خەتاب بۆ:**
یەزدگوردی سێهەم پاشای ساسانیەکان

بەناوی خودای گەورە..
بۆ یەزدگوردی پاشای فارسەکان

من ئایندەیەکی باش بۆخۆت و میلەتەکەت نابینم، مەگەر ئەم پێشنیازەی من قبوڵ بکەیت. تا پەیمان ( بەیعەت ) بەئێمە نەدەیت سەر زەمینت سەلامەت نابێت. دەکرێت لەم جیهانەدا تۆ فەرمانڕەوایەتی بکەیت. بەڵام بۆچی ناپرسی لەکۆتایدا بۆکوێ‌دەچیت؟ ئەوەتا خۆت دەبینی لەشکرەکەت لەهەموو لایەکەوە شکستی هێناوە. میلەتەکەشت خستوەتە بەردەم مەترسیەوە. من ڕێگەیەك پێشانی تۆدەدەم بۆئەوەی خۆت و میلەتەکەشت ڕزگاری بێت. وەرە سەر ڕێگەی پەرستنی خودای تاك و تەنیا. ئەوخودایەی دروستکەری هەمووشتێکی ئەم دونیایەییە. ئێمە پەیامی ئەو بۆتۆو بۆهەموو جیهان دەهێنین. ئەو خودای ڕاستەقینەیە. واز لە ئاگر پەرستن بهێنە. فەرمان بکە بەمیلەتەکەت دور بکەونەوە لەئاگر پەرستن وبابێن لەگەڵ ئێمە پێکەوە ڕوو لەخودای ڕاستی بکەین. وەرە خودای ڕاستەقینە بپەرستە، دروستکەری جیهان، ڕوە لە خودا بکەو، ئیسلام بکە بە ڕێگای ڕاستی خۆت بۆ پەرستنی خودا، ئیدی واز لە ڕێگە چەوتەکان بهێنەو، شەریك بۆ خودا دروست مەکە. ئیسلام بە ئاینی خۆت قبوڵ بکە. ئەمە تاقە ڕێگایە بۆتۆ و ئاشتی نێوان میلەتی فارس.



ئەگەر تۆ خەمی میلەتی فارستە دڵنیام ئەم ڕێگایە هەڵدەبژێری. پەیمان دان بەو ئاینە تاقە ڕێگای تۆیە.

الله اکبر
ئیمزا
عومەری کوری خەتاب: خەلیفەی ئیسلام
٦٣٦ زاینی.

تێبینی: یەزدگوردی سێهەم: لەسەردەمی فەتحی ئیسلام و عومەری کوڕی خەتابدا یەزگرد پاشای ساسانیەکان واتە فارسەکان بوو ، لەپاش ئەم نامەیە وەڵامەکەی یەزدگوردیش بۆ عومەری کوڕی خەتاب وەردەگێڕین بزانین ئەو چۆن وەڵامی خەلیفەی داوەتەوە.
یەزگرد : ٣٤ هەمین و ئاخرین پاشای ساسانیەکانە. بەڵام بە یەزدگوردی سێهەم ناسراوە.
ئەم نامەیە دوای شەڕی قادسیە نوسراوە.

**وەڵامی یەزدگوردی سێهەم بۆ:**
عومەری کوڕی خەتاب: خەلیفەی موسڵمانان.

بەناوی ، ئاهورمەزادە، خولقێنەری ژیان و ژیری.

تۆ لە نامەکەتدا نوسیبوت، دەتەوێت ئێمە بۆلای خوداکەت " الله اکبر " ڕێنوێنی بکەیت. بەبێ‌ئەوەی ئەو حەقیقەتە بزانیت، کە ئێمە کێین وچیمان پەرستوە.سەر سورهێنەرە کە تۆ لەسەر کورسی خەلیفەی عەرەبەکان دانیشتوی و ئاستی تێگەیشتنت لەگەڵ کەسێکی لاوازی عەربدا بەراورد دەکرێت. ڕێك ئاستی تێگەیشتنت بۆ ئێمە لەئاستی تێگەیشتنی بەدبەختەکان و سەرۆك خێڵەکانی عەرەبە.! عومەر: تۆ من بانگدەکەی بۆلای یەزدانێکی تاکپەرست. بەبێ‌ئەوەی بزانیت هەزاران ساڵە فارسەکان یەزدانی تاکیان پەرستوەو، ڕۆژی پێنج فەرزە کڕنۆشی بۆدەبەن. ساڵانێکە لەم سەرزەمینەدا کلتورو هونەر بەشێکە لەژیانی فارسەکان. سەردەمێك ئێمە نەریتی میوانداری و ڕەفتاری باشمان لەم جیهانەدا بونیات نا و، ئاڵای " بیرکردنەوەی باش، گوتەی باش، کرداری باش" مان هەڵگرتبوو. تۆو قەومەکەت مارمێلکەو قومقومەتان دەخوارد. چونکە شتێکی دیکەتان بۆ خواردن نەبوو.کچە بێ‌تاوانەکانتان زیندە بەچاڵ دەکرد. گەلی عەرەب هیچ بایەخێك بۆ خولقێنراوی خودا دانانێت، ئێوە سەری خولقێنراوی خودا دەپەڕێنن تەنانەت دیلەکانیش. دەستدرێژی دەکەنە سەر ژنان و کچەکانیشتان زیندە بەچاڵ دەکەن. پەلاماری کاروانەکان دەدەن. کوشت و بڕدەکەن و موڵکوماڵی خەڵکی داگیردەکەن. دڵی ئێوە



لەبەرد دروستکراوە. ئێمە هەمموو ئەو ڕەفتارە شێتانانەی ئێوە ڕەد دەکەینەوە. چۆن ئێوە دەتوانن خودایەك پیشانی ئێمە بدەن لەکاتێکدا ئەو هەمموو تاوانە دەکەن. تۆ بەمن دەڵێت کڕنوش بۆ ئاگر نەبەم!. ئێمە ئەوینی خولقێنەر و روناکی هەتاو لەتینی ئاگردا دەبینین. روناکی و ئاگر وامان لێدەکات تاکو تیشکی حەقیقەت ببینین و، دڵەکانمان بدەینە خودا روناکی بکاتەوە. یارمەتیمان دەدات تاکو لەگەڵ یەکتری نەرم و نیان بین. روناکمان دەکاتەوە، تاکو بۆ هەمیشە خۆشەویستی لەدڵەکانمان زیندوبمێنێتەوە. خودای ئێمە،" ئاهورەمزادە" یە. کە ئێوە تازە دەرکتان پێکردوەو ناوی " الله اکبر" تان لەسەر داناوە. بەڵام ئێمە وەکو ئێوە نین، ئێمە پەرە بەخۆشەویستی لەنێوان مرۆڤەکان دەدەین. ئێمە لەم سەرزەمینەدا پەرە بەخۆشەویستی دەدەین. هەزاران ساڵە ئێمە پەرە بە کلتوور دەدەین. بەڵام هاوکات ڕێزی کلتورەکانی تری جیهان دەگرین. بەڵام ئێوە بەناوی " الله" سەرزەمینێکی دیکە وێران و تاڵان دەکەن. ئێمەو خەڵکانی دیکە کوشت و بڕدەکەن. برسیەتی و هەژاری دێنن. بەناوی خوداوە ترس و هەژاری دەخولقێنن. ئایا ئەوە خودایە فەرمان بەئێوە دەدات بکوژن؟ تاڵان و وێران بکەن؟ ئایا ئێوە شوێن کەوتوانی خودان بەناوی ئەوەوە بەو شێوەیە هەڵسوکەوت دەکەن؟. یان بەناوی ئەوە لەو بیابانە وشك و برنگە هەڵهاتون و لەرێگای لەشکرکێشی و نوکی شمشێر وانەی خۆشەویستی خودا بڵێنەوە. ئێمە هەزاران ساڵە خاوەن کلتورین. پێمان بڵێ‌ئێوە بەو لەشکرکێشی و بێ‌حورمەیتکردن و کوشتنە بەناوی " الله اکبر" چ شتێکمان فێردەکەن؟. ئێوە چ شتێکتان فێری موسڵمانان کردوە تاکو ئەوانیش خەڵکی دی فێربکەن؟. ئێوە چ شتێك فێر بوون تا ئێستا بێن بەزۆر خەڵکی تر

فێربکەن؟. بەداخەوە زۆر بەداخەوە...
ئەمرۆ سوپای ئێمە لەبەردەم سوپای ئێوە شکستی هێناوە. ئێستاکە خەڵکی ئێمە دەبێت کڕنوش بۆ ئەوخودایە ببات، بەهێزی شمشێری عەرەب بۆمان هاتوە. پێشنیاز دەکەم سوپاکەت کۆبکەیتەوە و بگەڕێیتەوە بۆ بیابانەکانت. ئەو شوێنەی پێشوتر تێیدا ژیاوی. ئەو سوپایە بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنەی خوویان بەسوتانەوە گرتووە. ئەو شوێنەی حوکمی عەشایەرو خواردنی قومقومەکان بووە. من ڕێگا نادەم سوپا ڕێگرەکەت لە وڵاتی پڕبەبیت و بەرەکەتی ئێمەدا بژیت. ئەو جانەوەرانەی هێناوتن بۆ کوشتن و برین . ڕێگایان پێمەدە بەناوی "الله" وە ئەو کارانە بکەن. کۆتای بە ڕەفتارە تاوانکارەکان بهێنە، چون خەڵکی ئێرە لێبوردەو میوان خواز و پاکن. بۆهەرشوێنێك چوبن ئەم خەڵکە تۆوی هاورێیەتیان چاندوە. من داوا لەتۆ دەکەم. لە بیابانەکان بمێنەوە و نزیك مەبەرەوە لەشارە پێشکەوتوەکان. چونکە باوەڕەکانی تۆ زۆر مەترسیدار و دڕندانەیە.

" یەزدگووردی سێهەم "

تێبینی: ئەم نامەیە وەڵامی یەزدگوردی پاشای ساسانیە بۆ نامەکەی عومەری کوڕی خەتان خەلیفەی موسڵمانان. هەرچەن دەستەواژەی ناشیرین و هێرشی تێدایە. بەڵام ئەرکی ئێمە وەرگێرانی نامەکەیە نەك دەستکاری کردنی. چون ئەو مێژووە کاری ئێمە نیە دەستکاری بکەین. بەهیواین هیچ کەسێك ئیسلام یەتی بەسەر ئێمەدا نەفرۆشێت. پاشان نامەکەی عومەری کوری خەتاب لەخوارەوە هەیە . هەردوو ئەم نامەیەش



لە مۆزەخانەکان خەتی خۆیان پارێزراوە. بەهیواین خوێندنەوەی تەندروست بکەین بۆهەردوو نامەکە. بەبێ‌ئەوەی کەس وشەی بێمانا بەکار بهێنێت بۆ هیچ لایەکیان.

- ئەو دورشمانەی لەم نامەیەدا هاتووە. هی زەردەشت پێغەمبەرە، کە پێغەمبەرێکی کوردەو فارسەکان کردیان بەهی خۆیان.

**نامەیەکی : ئان سێکستۆن**
بۆ / لیندای کچی

بۆ کچەکەم لەتەمەنی چل ساڵیدا..

لیندای ئازیزم..

ئەم نامەیە لەناو فڕۆکەدا دەنوسم. بەنیازم بۆ خوێندنەوەی شیعر بچم بۆ سانت لویز. بەنیازیشم لە نیۆیۆرك چیرۆکێك بخوێنمەوە بمباتەوە بۆ لای یادەوەری دایکم. ئێستا تەنیا و تەنیا لەسەر کورسیەکەم دانیشتوم بەس بیر لە دایکم دەکەمەوە. دەزانم ئێستا خۆشم دایکم. دەزانم دایکم.....( قەڵەمەکەم وەستا).. دەزانم رۆژێك دێت تۆش تەنیاو تەنیا لە شوێنێکدا بیر لەمن دەکەیتەوە. لەوانەیە ئەو کاتە من مردبم و، تۆش کەیفت بەوەبێت دوو قسە لەگەڵ من بکەیت..

منیش حەزدەکەم لەگەڵ تۆ قسە بکەم.( لیندا!. لەوانەیە رۆژێك، یان دەمەو عەسرێك. لەتەمەنی چل ساڵیدا حەز بە ئیشکردن نەکەیت و بچیتە ناندەکەوە و لەپشت مێزێکەوە دانیشی و چا بخۆیت و بیری من بکەیت).

خۆشمدەوێت. پێمخۆشە پێت بڵێم..

یەکەم: خۆشم دەوێیت.

دووهەم: هیچ کاتێك نا ئومێدم مەکە.

سێهەم: تێدەگەم. منیش ئەوکاتەی لە تەمەنی تۆدابووم. یانی لەتەمەنی چل سالێدا بووم. زۆر پێویستم بە دایکم هەبوو.



ئەمە پەیامی منە بۆ لیندای چڵ ساڵی. هیچ شتێك گرنگی نیە. تۆ باڵندەیەکی ئاوازخوێنی منی. لیندای نازداری من. دەزانم ژیان ئاسان نیە. تەنیایەکی ترسناکی تیایە. دەزانم ئێستا تۆ لەهەر شوێنێك بیت بیری من دەکەیت. دەزانیت ژیان بە منەوە خۆشە. دەزانم نوسینەکانم زۆر خەمگینن بەڵام چی بکەم من گەیشتمە کۆتای ژیان. تۆش تا کۆتایی و تا سەر لوتکەکەش برۆ ژیان بکە. لیندای چل ساڵە. خۆشم دەوێت. ئیشەکانت و هەرشتێکت هی تۆبێت ئەوانیشم خۆشدەوێن. هەم خۆت و هەم هاورێکانت خۆش بوێت. ئەگەر دڵتەنگ بویت بۆم شیعرەکانم بخوینەوە یان لەدڵتا قسەم لەگەڵ بکە. من لە ناو هەردوو کیاندام. درۆ دەکەم لیندا، من عاشقی دایکم بووم و ئەویش عاشقی من بوو. بەڵام هەرگیز لەماڵی ئەو دانەنیشتم ئەوەتا ئێستا بۆی دڵتەنگم. بەس دەبێت ئینکاری ئەوە بکەم ئەوکاتەی من عاشقی ئەو بووم و ئەو عاشقی من بوو. من زۆر گەمژە بووم.!!

ئان سێکستۆن "

- ئاین یەکێکە لە شاعیرەکانی ساڵانی (١٩٢٨) لە مریکا لەدایك بووەو لە ساڵی (١٩٧٤) کۆچی دوای کرد.



**دوونامەی ناسرەدین شا بۆ عایشەخانی هاوسەری**

نامەی یەکەم:

عایشەخانم:

گیانەکەم، بەحاجی سروردا ئەم نامەیەت بۆدەنێرم، هیچ خەمی منت نەبێت و ئاسودەبە. لەسەلامەتی حاڵی ئێوە زۆر زۆر خۆشحاڵم، بەخوا ئەوەندە دڵم تەنگە بۆت هەر حساب ناکرێت. زیاد لەحەد چویتە ناو دڵمەوە. هەڵبەتە خۆت باش ئەزانی بۆچی تۆم دەوێت. هیچ کاتێك ناتوانم لەبیرت بکەم، ئینشەئەڵلا هەمیشە لات ئەمێنمەوە. ئینشەئەڵلا سبەی دەتبینم. و ئاسودە دەبم.

نامەی دووهەم:

عایشە خانم

گیانەکەم، بیستم خەفەتباری، سوێند بەخوا یەك تاڵەموی چڵکنی پرچی تۆ نادەم بەهەموو ژنانی دونیا، ئەگەر بزانی چەن تۆم خۆشدەوێت هەرگیز خەفەت ناخۆیت. ئەمجارە سوێندت دەدەم بە گیانی خۆم کەئیتر حەفەت نەخۆیت. ئیتر ئاسودەبە. بەخودا کە تۆ خەفەت ئەخۆیت ئیتر من حاڵم پەرێشان دەبێت. وەك سەگ گاز لەخۆم دەگرم. توسەری گیانی من خەفەت مەخۆ. وەڵامێکی خۆشم بدەرەوە با ئاسودەبم. یەك ئەنگوستیلەی ئەڵماسی نایابم بۆ بۆناردوی لە حاجی سروری وەربگرە.

تۆ عایشە گیانی منی. تۆ نادەم بەهەموو دونیا.

# کتێبە چاپکراوەکانی یانەی قەڵەم

## (٢٠٠٥-٢٠١٣)

| ز | ناوی کتێب | بابەت | ناوی نووسەر | ناوی وەرگێڕ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | فریوو خۆحەشاردان | چیرۆك | عەتا محەمەد | |
| ٢ | ئایین (هزر سیاسەت) | فیکری | کۆمەڵێك نووسەر | یاسین عومەر |
| ٣ | بەیەکداکێشانی شارستانێتی | فیکری سیاسی | سامئیل هانتینگتۆن | ئاوات ئەحمەد |
| ٤ | سوەیلا | ڕۆمان | شارام قەوامی | |
| ٥ | ڕۆژی هاتنەکەی عودەی | چیرۆك | ئاوات عەبدوڵلا | |
| ٦ | سیماکانی عەقڵانیەتو خورافە | فیکری سیاسی | فالح عەبدولجەبار | ئاوات ئەحمەد |
| ٧ | وەنەوشەکەی چوار شەممان | چیرۆك | کۆمەڵێك نووسەر | شیرین.ك |
| ٨ | نەبەهەشت لەسەر زەویدایە | فیکری | کۆمەڵێك نووسەر | ئومێد عوسمان |
| ٩ | فیمینیزم | فکری | نوره فەرج المساعد | عەبدوڵلا تاهیر |
| ١٠ | لەروانگەی خۆرئاواوە | فکری | کۆمەڵێك نووسەر | ئومێد عوسمان |
| ١١ | منداڵباز | ڕۆمان | فەرهاد پیرباڵ | |
| ١٢ | کیمیاگەرانی وشە | لێکۆڵینەوەی | کۆمەڵێك نووسەر | یاسین عومەر |
| ١٣ | گوزارشتی مۆسیقا | هونەری | فواد زەکریا | حەمە کەریم عارف |
| ١٤ | خەمەکانی ڕۆشنگەری | فکری | هاشم ساڵح | ئاوات ئەحمەد |
| ١٥ | یەڵماز گۆنەی | | کۆمەڵێك نووسەر | حەمە کەریم عارف |
| ١٦ | هەناسەی پێخەفەداخراو | چیرۆك | چنوور سەعیدی | |
| ١٧ | سادقی هیدایەت | لێکۆڵینەوە | حەمە کەریم عارف | |
| ١٨ | یادەوەرییەکانی کۆڵانێکی خاپوور | چیرۆك | سیامەند هادی | |
| ١٩ | قالاو یەعنی قەفەسێکی خاڵی | شیعر | کەمال ئەمینی | |
| ٢٠ | تیانووسی پاشای هیچ | شیعر | یاسین عومەر | |
| ٢١ | لەسێبەری پرسیاردا | دیداری فیکری | سەمەد ئەحمەد | |
| ٢٢ | زەمین وەك پرتەقاڵێك شینە | شیعر | پۆل ئیلوار | فەرهاد پیرباڵ |
| ٢٣ | گێلاسی خوێن | ڕۆمان | عەتا محەمەد | |
| ٢٤ | حەرامترین | چیرۆك | عەلی پێنجوێنی | |
| ٢٥ | ڕەنگە کاڵبووەکانی دنیا | شیعر | گەروسعەبدولمەلیکیان | مەریوان هەڵەبجەیی |
| ٢٦ | کۆنترۆڵی میدیا و ڕاگەیاندن | ڕاگەیاندن | نوام چۆمسکی | کەریم قادر پوور |
| ٢٧ | مۆزارت، شمشاڵی ئەفسوناوی | هونەری | ئەنیس مەنسور | مامۆستا ئەحمەد |
| ٢٨ | ئەفرێنەرانی خۆر ئاوا | فکری | هاشم ساڵح | ئومێد عوسمان |
| ٢٩ | دەریایەك لەوشە | دیدار | مهاباد قەرەداغی | |
| ٣٠ | داهێنانو مەرگ | لێکۆڵینەوە | سەلاح حەسەن | |
| ٣١ | ژنێ لەبەردەم وەرزێکی | ژیان و بەرهەم | فروغ فروغزاد | ئازاد بەرزنجی |
| ٣٢ | گەڕان بەدوای قولاییدا | چیرۆك | پاتریك زوسکیند | شیرین. ك |
| ٣٣ | پابەندبووین ئەدەبی | لێکۆڵینەوە | ڕەمەزان لەباح | ئاری عوسمان |



| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٣٤ | مێرووولەو کۆتر | منداڵن | ئیزۆپ | جەبار سابیر |
| ٣٥ | منو باپیرەو نەنە | منداڵن | ستیوارت همپڵ | جەبار سابیر |
| ٣٦ | دیالۆگ، خەندە، ئازادی | لێکۆڵینەوە | میخائیل باختین | هادی محەمەدی |
| ٣٧ | مامزێر | ڕۆمان | کاروان کاکەسوور | |
| ٣٨ | ئێمە گوناهین | چیرۆك | هیوا ئەمین نژاد | |
| ٣٩ | شەبەنگی بوون، زایەڵەی.. | ڕاڤەی دەق | هەندرێن | |
| ٤٠ | خۆشم ئەوێی شێتەگیان | منداڵن | ستیوارت همپڵ | جەبار سابیر |
| ٤١ | فریشتەکان | چیرۆك | ڕەسوڵ یۆنان | جەبار سابیر |
| ٤٢ | پاییزی عومری من | شیعر | ژاوێن شاڵی | |
| ٤٣ | نەتەوەو حەکایەت | لێکۆڵینەوە | ڕێبوار سیوەیلی | |
| ٤٤ | گەمەی پاقیژە | شانۆنامە | ژان ژینێ | دلاوەر قەرەداغی |
| ٤٥ | ماجەراکانی سەلمانی فارسی | ڕۆمان | یوسف عیزەدین | |
| ٤٦ | گەڕانەوەی خوشکەکان | چیرۆك | هەورامان وریا قانع | |
| ٤٧ | تارژەنی ڕەنگ | حیکایەت | عەتا محەمەد | |
| ٤٨ | ئەوەی دنیا رزگار دەکات جوانییە | کۆدیدار | هیوا قادر | |
| ٤٩ | پیاسەیەك بە تەنیا | وتار و... | توانا ئەمین | |
| ٥٠ | دەروازەیەك بۆ فەلسەفەی.. | فەلسەفی | د.حسێن بەشیریە | ڕەزا مەنوچەهری |
| ٥١ | یار لە باخە | شیعر | هیوا قادر | |
| ٥٢ | سوارەکان بە قاچاخ بووك.. | ڕۆمان | کاروان کاکەسوور | |
| ٥٣ | جیهانی سێیەم و جیهانی مۆدێرن | لێکۆڵینەوە | لوقمان ڕەئوف | |
| ٥٤ | باران ڕەدوکەوتووی قەسیدەکانی | شیعر | ئەنوەر ڕەشید عەولا | |
| ٥٥ | کچی ناو تابلۆکە | چیرۆك | توانا ئەمین | |
| ٥٦ | ڤیسکۆنتی دوولەت بوو | ڕۆمان | ئیتالۆ کالفینۆ | جەبار سابیر |
| ٥٧ | ئیستاتیکای گێڕانەوە | لێکۆڵینەوە | ئارام سدیق | |
| ٥٨ | چاوەڕوانی | ڕۆمان | ئارام کاکەی فەلاح | |
| ٥٩ | زێوان | شیعر | سەباح ڕەنجدەر | |
| ٦٠ | فەهرەست | ڕۆمان | عەتا محەمەد | |
| ٦١ | لاییستییە چییە؟ | لێکۆڵینەوە | شیدان وەسیق | فازل مەحمود وەلی |
| ٦٢ | بلیتێك بۆ جەهەنەم | چیرۆك | ئارام کاکەی فەلاح | |
| ٦٣ | مەلەکوت | ڕۆمان | بەهرام سادقی | سەعید سلێمانی |
| ٦٤ | خواجەنەسرەدین | ڕۆمان | عەتا محەمەد | |
| ٦٥ | ئۆنتۆلۆجی، بنەڕەتی و بوونی | فەلسەفی | د. محەمەد کەمال | |
| ٦٦ | لە تێکستەوە بۆ مانا | لیکۆڵینەوە | ئارام سدیق | |
| ٦٧ | حیکایەتی عەشقی بی قاف و.. | چیرۆك | مستەفا مەستوور | جەبار سابیر |
| ٦٨ | پەیکەری فەرهاد | ڕۆمان | عەباس مەعروفی | کەریم قادرپوور |
| ٦٩ | دوا سروودی بەلەمەوانەکان | شیعر | سەعید سلێمانی | |
| ٧٠ | ژماردن | کۆمەڵەچیرۆك | کامیار ئەحمەدی | |
| ٧١ | گەمژە ئێمە مردووین | مینیماڵ | ڕەسوول یۆنان | جەبار سابیر |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٧٢ | ژن و پیاو و ئاکاری سێکسی | لێکۆینەوە | ویل دۆرانت | دڵشاد خۆشناو |
| ٧٣ | سەردەستەکان | چیرۆك | ماریۆ بارگاس یۆسا | جەبار سابیر |
| ٧٤ | باڵندەکەی من | رۆمان | فەریبا وەفی | حەمە کەریم عارف |
| ٧٥ | نامەکانی کافکا و ریلکە | نامەی ئەدەبی | کافکا و ریلکە | غەفوور سالح عەبدوڵڵا |
| ٧٦ | سوارەکانی وشە | چیرۆك | جوتیار ئەحمەد | |
| ٧٧ | دزینی خەونەکان | چیرۆك | ئارام کاکەی فەلاح | |
| ٧٨ | نیگایەك پڕ لە گرفتاری | چیرۆك | فاروق هۆمەر | |
| ٧٩ | سەرگەردانییەکانی پیاوێك | چیرۆك | فاروق هۆمەر | |
| ٨٠ | ئەبی و نابێ رایەکی زمانەوانییە | چیرۆك | محەمەد ئەمین ئەحمەد | |
| ٨١ | خۆردزین | چیرۆك | محەمەد ئەمین ئەحمەد | |
| ٨٢ | کۆمەڵگەی کوردی پەرەسەندنی | لێکۆڵینەوە | عەتا قەرەداخی | |
| ٨٣ | جەمیلە | رۆمان | جەنگیز ئایتماتۆف | حەمە کەریم عارف |
| ٨٤ | مردنێکی تر | چیرۆك | خۆرخە لویس بۆرخیس | یاسین عومەر |
| ٨٥ | خودا، لەسەری مرۆڤدا | گفتوگۆی فیکری | توانا ئەمین | |
| ٨٦ | دەسپێك لە چیرۆکی کوردیدا | لێکۆڵینەوە | ئارام سدیق | |
| ٨٧ | کتێبی لم | چیرۆك و شیعر | خۆرخە لویس بۆرخیس | مەلوول |
| ٨٨ | نێچیر | رۆمان | کنزا بۆرۆ ئاوێ | جەبار سابیر |
| ٨٩ | تۆم هەبیت... | شیعر | داستان بەرزان | |
| ٩٠ | تاپۆیەك لە تاریکیدا | کۆمەڵە چیرۆك | سەعید سلێمانی | |
| ٩١ | عەشق لە هەر کوێ بێت | کۆمەڵە چیرۆك | تۆڵستۆی | هیوا خەیات |
| ٩٢ | رۆژێکی تۆزاوی | کۆمەڵە چیرۆك | باران | |
| ٩٣ | فەقێکانی تاریکی | رۆمان | سەلیم بەرەکات | غەفوور ساڵح عەبدوڵڵا |
| ٩٤ | ژان دو لوین | رۆمان | ژاك تۆرنییە | جەبار سابیر |
| ٩٥ | دز و سەگەکان | رۆمان | نەجیب مەحفوز | بەکر دەروێش |
| ٩٦ | مانگی رووی خودا ماچ بکە | رۆمان | مستەفا مەستوور | جەبار سابیر |
| ٩٧ | زێراب و بەیازی گوڵفرۆشێك | کۆمەڵە چیرۆك | ئارام کاکەی فەلاح | |
| ٩٨ | کراسەکەم ببورە | شیعر | فاتمە فەرهادی | |
| ٩٩ | ئەو پیاوەی سیبەری خۆی فرۆشت | رۆمان | ئادلبر ڤۆن شامیسۆ | حەمە کەریم عارف |
| ١٠٠ | سەفەر بە ئەندێشەی پیتدا | لێکۆڵینەوە | ئارام سدیق | |
| ١٠١ | پاکسیما | چیرۆك | سامان کەریم | |
| ١٠٢ | کەلتور، تیۆر و چەمکەکان | لێکۆڵینەوە | زەکی ئەلمیلاد، | عەبدوڵڵا مەحمود |
| ١٠٣ | پەرجووی سینەما | وتار و گفتوگۆ | کۆمەڵێك نووسەر | ئەکبەر حەسەن |
| ١٠٤ | شەیتان و خودا | شانۆنامە | ژان پۆل سارتەر | شۆرش غەفووری |
| ١٠٥ | نانی رووت | رۆمان | محەمەد شوکری | د. نەجاتی عەبدوڵڵا |
| ١٠٦ | کیمیاگەر | رۆمان | پاولۆ کۆیلۆ | بەرزان عوسمان |
| ١٠٧ | ئاشنابوون بە کافکا | لێکۆڵینەوە | پۆڵ سترانێرن | کاروان حەسەن |
| ١٠٨ | ئاشنابوون بە بیکێت | لێکۆڵینەوە | پۆڵ سترانێرن | کاروان حەسەن |
| ١٠٩ | ئاشنابوون بە جیمز جۆیس | لێکۆڵینەوە | پۆڵ سترانێرن | کاروان حەسەن |



| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ١١٠ | ئاشنابوون بە دۆستۆیڤسکی | لێکۆڵینەوە | لیونید گرۆسمان | غەفوور سالح عەبدوڵڵا |
| ١١١ | دادوەر و جەلادەکەی | رۆمان | فریدرخ دورنمانت | کەریم پەرەنگ |
| ١١٢ | من و کامێراکەم | چیرۆك | ئارام کاکەی فەلاح | |
| ١١٣ | بووم بە ژێر رۆژە خێراکانی... | شیعر | داستان بەرزان | |
| ١١٤ | کۆترەکانی باوکم | شیعر | کۆچەر ئەبوبەکر | |
| ١١٥ | تێزی مێژووی تورك | لێکۆڵینەوە | ئیسماعیل بێشچی | |
| ١١٦ | ئایدیاڵە سیاسییەکان | لێکۆڵینەوە | برتراند راسڵ | ئەکبەر حەسەن |
| ١١٧ | گوێبگرە با ستران دەچڕێ | ئەدەبی | هاروکی موراکامی | جەبار سابیر |
| ١١٨ | باوکت لە جەنگە | چیرۆك | کۆمەڵێك نووسەر | هەژار عوسمان |
| ١١٩ | ئەدگار ئالان پۆ | لێکۆڵینەوە | کۆمەڵێك نووسەر | حەمە کەریم عارف |
| ١٢٠ | نامەی سەرکردەکان.. | نامەی ئەدەبی | کۆمەڵێك نووسەر | نەبەز گۆران |
| | | | | |